# ڕشتەی مرواری ۷





کۆمەڵە ئەدەبییەکی هەرە بەنرخە
لە فەلسەفە و بیر و باوەڕی کوردی

عەلائەدین سەجادی

٦

| | |
|---|---|
| سرشناسه : | سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م. |
| عنوان و نام پدیدآور : | ڕشتەی مرواری: کۆمەڵە ئەدەبییکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی/ دانراوی عەلائەددین سەججادی. |
| مشخصات نشر | سنندج : کردستان ، ۱۳۹۹. |
| مشخصات ظاهری | ۸ ج.؛ ۲۱/۵×۱۴/۵ سم. |
| شابک | دوره : ٨-٤١١-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨ / ج١ : ٥-٤١٢-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨<br>ج٢ : ٢-٤١٣-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨ / ج٣ : ٩-٤١٤-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨<br>ج٤ : ٦-٤١٥-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨ / ج٥ : ٣-٤١٦-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨<br>ج٦ : ٠-٤١٧-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨ / ج٧ : ٧-٤١٨-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨<br>ج٨ : ٤-٤١٩-٩٨٠-٩٦٤-٩٧٨ |
| وضعیت فهرست نویسی : | فیپا |
| یادداشت : | کردی. |
| موضوع : | شوخی‌ها و بذله‌گویی‌های کردی-- عراق-- قرن ۲۰م. |
| موضوع : | ۲۰th century -- Kurdish wit and humor-- Iraq |
| موضوع : | داستان‌های طنزآمیز کردی |
| موضوع : | Humorous stories, Kurdish* |
| رده بندی کنگره : | PIR۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی : | ۸فا۹/۲۸۲۶۲ |
| شماره کتابشناسی ملی : | ۷۴۲۸۵۳۱ |
| وضعیت رکورد : | فیپا |

# ڕشتەی مرواری

-٦-

کۆمەڵە ئەدەبیێکی هەرە بە نرخە
لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی

دانراوی:

**مامۆستا عەلائەددین سەججادی**



انتشارات کردستان
سنە

انتشارات کردستان

# ڕشتەی مرواری

## -٦-


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ڕشتەی مرواری |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | مامۆستا عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پێداچوونەوە و هەڵەبژێری: | ژیلا قەوامی / ڕەفیق ڕۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ۱۳۹۰ـ۲۰۲۱ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۱۰۰۰ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ۱۸۰ لاپەڕە (صفحەی رقعی) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابک: | دوره: ۸ ـ ٤۱۱ ـ ۹۸۰ ـ ۹٦٤ ـ ۹۷۸ ـ شابک جلد (٦): ۰ ـ ٤۱۷ ـ ۹۸۰ ـ ۹٦٤ ـ ۹۷۸ |





سنندج، چهارراه شهدا، پاساژ عزتی، انتشارات کُردستان، تلفن: ۰۸۷ ۳۳۱۶۵۳۸۲

سنە، پاساژی عیزەتی، بڵاوکردنەوەی کوردستان، تەلەفوون: ۰۰۹۸ ۸۷ ۳۳۱۶۵۳۸۲

# ناواخن

# پێشەکی

بیری منالّی تیژە. سالّ سالّی (١٣٤٧)ی هیجری بوو، سەید ئەحمەد ناوێك بۆ جاری سێیەم لە مەککە و مەدینەوە پەخشەیەکی بلاّو کردەوە کە پێغەمبەرﷺ لە خەوا پێی وتووم لە سالّی (١٣٥٠)دا دنیا دوایی دێت، کێوەکان ئەڕووخێن و عالەم ئیتر هەپەڕوون بە هەپەڕوون ئەبێت.

فلاّنی! لە مزگەوتەکان و لە مالّەکانا شین و شەپۆڕێك بوو ئەو سەری دیار نەبێتەوە. شێخ جەلالی برای شێخ نەجیبی قەرەداغی، حاجی فەتاحی قەزاز، ئەحمەدی قادر چاوش، حاجی مەحەمەدی عەنبەر و گەلێکی تریش -یاڕەبی بەڕەحمەت بن!- لەسەر سەکۆکەی مزگەوتی شێخ جەلال پرمەپرم ئەگریان و دەستەسڕەکەی دەستیان بە تەواوی تەڕ بووبوو؛ عالەمەکەی تریش بۆ گریان شوێنیان ئەکەوتن. منی نەگبەتیش هەر ئەگریام. ئەوا ئەوان وەکوو کابرا وتی: بەهەر جا! من بۆچی؟ من هێشتا لەناو منالاّنا یاریم ئەکرد، نە ئەمزانی دنیا چییە، نە قیامەت.

سالّ بوو بە (١٣٥٠)، دنیا نەبوو بە دنیا ئاخری. لە دوای ئەوەش سالّ هەر سنگی ئەنا بۆ پێشەوە. تا بوو بە سالّی (١٣٨٩) دنیا هەروەکوو خۆی مایەوە و نەبوو بە دنیا ئاخری. وا دیار بوو سەید ئەحمەد -خوا سەلامەتی کا!- خەوەکەی دەست هەلّبەست بوو. لە ماوەی ئەم ٥١ سالّەدا تۆ ئەزانی

چ جۆرە کارەساتانێ ڕوویان دا؟ وەکوو ئەڵێ: ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە؛ ڕۆژی پێرێ ڕۆیی، ڕۆژی دوێنێ هات، دوێنێ ئیمڕۆی بە شوێنا هات. هەموو وەکوو تۆمار پێچرایەوە.

با بێینەوە سەر ساڵی (١٩٥٧)ی میلادی. لەو ساڵەدا بە حساب، بوو بە ٣٠ ساڵ دوای دوایی هاتنی، بە خەوەکەی سەی ئەحمەد! لەباتی ئەوە دنیا دوایی بێت، کەچی بەرگی یەکەمی «ڕشتەی مرواری» لەدایك بوو. هەر ئەو ساڵە بەرگێکی‌تر. ساڵی (١٩٥٨) بەرگی سێیەم، (١٩٦٩) بەرگی چوارم، (١٩٧٢) بەرگی پێنجەم. لەو ماوەوە تا ئێستا ئیش و کاری‌تر ماوەی نەدام بتوانم لەسەری بڕۆم. ئەوا لەم ساڵەدا ساڵی (١٩٧٨) گەڕامەوە بۆ کۆنەچاڵ. بۆ دەرکردنی بەرگی شەشەم. ئەمەی کە لەبەردەستتایە.

ئم! مامۆستا ئەڵێ: ڕشتەی مرواری لەو ساڵەدا لە دایك بوو! لای وایە شێری بە گوێ گرتووە، وەیا ئەستێرەی لە ئاسمان هێناوەتە خوارەوە، یا کەشتی لە ئەرزەوە بردووە بۆ ئاسمان!

برا، کاڵا لە قەد باڵایە. ئەو نەتەوەیە کە کەشتی بردووە بۆ ئاسمان غەیری نەتەوەکەی منە. من کە لە نەتەوەی کوردم هەر ئەوەندەم لەدەست دێ. تۆ دەرزییەك دروست بکە من سووژنێك دروست ئەکەم؛ من درێغیم نەکردووە، هەر ئەوەندەم لەدەست دێت. هەموو کەس نابێ بە داهێنەر و دوکتۆر و موهەندس و کیمیاگەر. «نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب». من ئەوەم لە دەست دێت کە خزمەتی نەتەوە بکەم لە ڕێگای ئەدەبەوە. تا بمێنم لەو ڕێگایەدا ئینشائەڵڵا درێغ ناکەم.

لە ماوەی ئەم ٢١ ساڵەدا گەلێ لە دۆستانی دێرینەم لە دەست دەرچوون. گەلێ لەو کەسانە کە شتیان بۆ گێڕابوومەوە، وەیا بۆیان ئەناردم بۆ «ڕشتەی مرواری»، لە دەسم دەرچوون و ڕوویان کردەوە بۆ بارەگای ئیزەدی. وا دیارە

خەوەکەی سەی ئەحمەد لە ماوەی ئەم پەنجاویەك ساڵەدا بە چاو ئەوانەوە هەندێکی هاتە دی. ئەوان ڕۆیشتن و من هەر مامەوە. لە بەرگی یەکەمەوە دوور نییە هەندێ کەس بیانوتایە: ئەویش ئەچێتە ناو کووپەڵەکە، کەچی دووەم هات و من نەچووم، سێیەم هات و من نەچووم، چوارەم و پێنجەم هات هەر نەچووم، خۆ بەخوا هەر ئەچم؛ «مەولەوی» ئەڵێ:

**وە مەرگت دیدەم هانە گوزەردا   منیچ ڕام لای تۆن، ئارۆ نە فەردا**

بەڵام توخوا وازم لێبێنە با زڵیاوپڵیاوێکیتر بکەین.

ناڵێم ئەدەب چییە و کەڵکی چییە بۆ نەتەوە؛ چونکە لە پێشەکی بەرگەکانیترا ئەمەم زۆر وتووە، زۆر وتنیش بۆ قورعان خۆشە! لێرەدا هەر ئەوەندە ئەڵێم: «ڕشتەی مرواری» چەند بەرێکی بەکەڵکی هەیە: یەکەم ئەدەبە و ئەدەب نەتەوەیە. دووەم ڕێبازێکە بۆ خوێندنەوەی کوردی. زۆر شت هەیە ڕێبازە، بەڵام ئەم وا لە مرۆڤ ئەکا پێوە بچێت و بیخوێنێتەوە و هیچ تاقەتیشی نەچێ، چونکە زاخاوێکە بۆ مێشك. سێیەم وەکوو لەش پێویستیە بە حەسانەوە، فیکر و مێشکیش ئەو پێویستییەی هەیە. حەسانەوەی فیکر ئەوەیە کە خۆشییەکی بگاتێ، بەبێ ئەوە کە لەشەکە بۆی بکەوێتە عەزیەتەوە. قسەکانی «ڕشتەی مرواری» تۆ بە گاڵتە وەری ئەگری و خۆشییەك ڕوو ئەکاتە فیکر و مێشکت. لەگەڵ ئەم خۆشییەشا دەرسێکە بۆ هەموو ڕووداوێکی ژیان، کە ئەم دەرسە لە پشت پەردەی خوێندنەوەکەوەیە.

شتێکیتر ماوەتەوە با بیڵێم:

ئەو ساڵە کە لە «وەندەرێنە» بووین، سەبەتەیە ترێ دۆشاوی گیانمان ئەهێنا بۆ حاجی فەرەجی پڵاوخۆر لە شار، بە چوار ڕووپیە و سێ عانە.

حاجی فەرەجی ڕەحمەتی هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە بەلایەوە ئەمایەوە، لەبەر گرانیی بۆی نەئەفرۆشرا. زەمانی هۆقە بوو، نەك هۆقەی ئەستەموڵ، بەڵکە هۆقەی سولەیمانی کە سێ کیلۆ و نیوی ئێستە بوو. هۆقەی ئەدا بە چوار عانە، کەسێ نەبوو بڵێ: کەرت بە چەند. ئەیانوت: بەخوا گرانە پێمان ناکڕێ.

ئێستە لەسەر مەرج تۆ کیلۆیەك ـ نەوەك هۆقەیەك ـ لەو ترێ دۆشاوییە بدە بە من بە هەشت ڕووپیە کە ئەکاتە شەشسەد فلس، من دوعات بۆ ئەکەم. دەسا حاجی فەرەج لە کوێیت گۆڕ هەڵتەکێنە. کەچی بۆ بەدبەختی من هەر شتێك دەرئەکەم و هەرشتێك ئەنووسم، ئەڵێن: ئای بەخوا گرانە! بەخوا زۆر دڵم پێی خۆش ئەبێ ئەگەر ئەم قسەیە نەکەی، ئەو وەختە هەردووکمان پێکەوە دەست ئەگرین بە دەستی یەکەوە. بە دوو قۆڵی ئەچین بۆ جەحەنەم، یا بۆ بەهەشت! تۆ سەرپشك بە. کامیت ئەوێ من شوێنت ئەکەوم، هەر بەو شەرتە نەڵیت کتێبەکە گرانە. زۆر لەم قسەیە ئەترسم! ئای ترس! هەر شتێکی تر بڵێیت گەردنی خۆم و خۆت ئازاد بێ.

**عەلائەددین سەججادی**

**١٩٧٨/٥/٢٨**



# تاڤگەی ئێلاخ

١. دوو برا لێفەیەکی بچووکیان کڕیبوو. دنیا زستان بوو، شەوێ ویستیان پێی بنوون کابرایەکی کوردیش بوو بە میوانیان چوو لە ناوەڕاستیانەوە ڕاکشا. شەوێ بە تەواوی ساردی کرد، براکان هەریەکە لەبەر سەرما لێفەکەیان بۆ لای خۆیان ڕائەکێشا. کابرای میوانیش هیچ نقەی نەئەکرد، تەنها ئەوە نەبێ ئەیوت: «من پارەم نەداوە ڕایناکێشم». لەگەڵ ئەوەش هەرکام لەوان ڕایانبکێشایە بەشی ئەوی هەر ئەمایەوە.

٢. مەلا یووسف هەبوو لە «تەنگیسەر»، مەلا عەلیش لە «سەرزەل»؛ (سەرزەل و تەنگیسەر دوو گوندن لە قەرەداغ) کە یەکێك ئەچوو پرسیارێکی شەرعی لە مەلا یووسف ئەکرد مەلا یووسف ئەیوت: «برا ئەمە گیای من و مەلا عەلی سەرزەل نییە؛ ئەمە گیای شێخ نەجیبی قەرەداغە». (شێخ نەجیب عالمێکی زۆر گەورە بوو لە زەردیاوای قەرەداغ) مەلا عەلی چەند جارێك ئەم قسەی مەلا یووسفە ئەبیستێتەوە. ڕۆژێك ئیتر جیقڵدانی هەڵیناگرێ، ئەچێتە سەر مەلا یووسف پێی ئەڵێ: «مەلا یووسف!. خوا بتگرێ، تۆ کە شتێك نازانی من بە خۆتەوە بۆچ ئەپێچی؟ بەچیدا ئەزانی کە منیش نایزانم؟»).

٣. کابرایەکی کوردی جافەتی برینێك لە لاڕانی هاتبوو، خۆی چاوی لێنەبوو. دوانزە کوڕی هەبوو بە یەکێکیانی وت: «ئا، ڕۆڵە وەرە

سەیرێکی بکە بزانە چۆنە؟» کوڕە هات و سەیری کرد وتی: «باوە، ئاوی تێزاوە». ڕووی کردە یەکێکی تریان پێی وت: «ڕۆڵە! ئاتۆش وەرە سەیرێکی بکە». ئەویش هات وتی: «بابە سەرەکەی سوور بووەتەوە؛ لام وایە دەمەدەمی گەیشتنیەتی». بانگی یەکێکی تریانی کرد ئەویش هات قسەیەکی تری کرد. تا هەر دوانزەیان هاتن و هەریەکە بە جۆرێك پێیان وت. پاشان کابرا سەری بەرز کردەوە و وتی: «ئۆ خوا! خەڵکی وە یەك کەسەوە هەموو خەبەرێکی لە ئەستەموڵەوە بۆ تێرنەوە، من وە دوانزە کوڕەوە خەوەرێکی ڕاستم لە قنگمەوە تا گوێچکەم دەست ناکەوێ!».

٤. دزیك شەوێك ئەچێتە ماڵە کوردێك. هەرچەندە ئەگەڕێ هیچی دەست ناکەوێ، بە ناچاری ملی ڕێ ئەگرێ و بەرەو دوا ئەگەڕێتەوە. خاوەن ماڵەکە ئاگای لێیە، پێی ئەڵێ: «بەخێری باوکت قاپییەکە پێوە دە». ئەویش ئەڵێ: «بە ڕیشی بابتەوە، زۆرم لێت دەستکەوت؛ بێگارێکیشم پێ بکە!».

٥. حاجی دەروێش هەبوو هەر شتێ خوا دایناوو ئەو نەیبوو؛ خانووە شڕێکی هەبوو ستاری تێدا گرتبوو. شەوێك بۆ پەن دزێك ڕێی لێ هەڵە ئەبێ و ئەچێتە ماڵەکەی. هەرچەندە ئەگەڕێ هیچی دەست ناکەوێ. حاجی دەروێش لێی بەئاگا دێت، پێی ئەڵێ: «ماڵوێران! من بە ڕۆژی ڕووناك هیچم لێ دەست ناکەوێ؛ تۆ بە شەوی تاریك مەگەر گووی تیا کۆ بکەیتەوە».

٦. مەلا ئەحمەدی «عەنەب»ـی هەبوو لە سولەیمانی لێیان ئەپرسی: مەلا ئەحمەد ڕاست ئەکەن ئەڵێن: تۆ هەتیوبازیت؟ ئەویش ئەیوت: «بە قسەی خەڵك وا ئەڵێن!».

٧. کابرایەك لە ژووری مزگەوتێکا خەریك بوو کەرێکی ئەگا، کابرایەکیتر بە سەریا چوو، تفێکی لێکرد و پێی وت: تۆ هیچ شەرم ناکەی لە ژووری مزگەوتا ئیشی وا ئەکەی؟ کابرای کەرگێ ئاوڕێکی لێدایەوە و وتی: «ئا تۆ لێمگەڕێ تا لەم ئیشە خێرە ئەبمەوە، با هەروا تۆ تفت کردبێ لەخانەی خوا».

٨. کابرایەکی کورد ژنێکی هەبوو، ژنەکەی مرد. تۆپەڵێ قوڕی دا بە سەریا و دەرپێی ژنەکەی هێنا خستیە سەر شانی و دەستی کرد بە باوکەڕۆ. خەڵکەکە هەر لە دوورەوە سەیریان ئەکرد. ئەمیش بانگی کرد: «ئەرێ عەشرەت! ڕووی باوکی تایفەتان ڕەش وێ! ئەوە بۆچ شیوەنم لەگەڵ ناکەن؟ بۆچ هەر ژنی من وو؟!»

لە پاش شەش حەو ڕۆژ، ڕۆژێك هاوماڵەکانی چوونە لای دیسان دەستی کردەوە بە گریان و باوکەڕۆ. خەڵکەکە وتیان: برا! ئەوەندە مەگری، گریان کەڵکی نییە؛ دوعای بۆ بکە. وتی: «بەخوا عەشرەت بۆ خۆی ناگریم، بیری قسە خۆش‌خۆشەکانی ئەکەمەوە ئیتر خۆمم پێ ناگیرێ. تەنانەت یەکێ لە قسە خۆشەکانی ئەوەبوو کە ئێوارەیەك دووبەدوو لە دەوری مەنجەڵە شیرەکە دانیشتبووین تڕێکی کەند. من وتم: بە کێرم، ئەو وتی: نەوەڵڵا بە ڕیشت. ئینجا ئەو قسەخۆشانەی کە بیرم ئەکەوێتەوە ئیتر چۆن نەگریم؟».

٩. جارێك کوڕوکاڵ کۆ ئەبنەوە لە سولەیمانی ئەڵێن: با بچین بۆ لای ئەحەی کرنوو تۆزێك لەگەڵی ڕابوێرین. ئەچن لەو دەشتی نزیکی «کارێزی دایکی پاشا»یەدا تووشی ئەبن. دەست ئەکەن بە قسەکردن لەگەڵیا. یەکێکیان ئەڵێ: خاڵەحمەد با لەم شوێنەدا

خانوویێکت بۆ دروست کەین؛ بە شەوانەیشا تیایا کۆ ئەبینەوە گۆرەوی‌بازی و شتی تێدا ئەکەین. یەکێکی‌تر هەڵئەداتێ ئەڵێ: ئەم شوێنەی بۆ ژووری دانیشتن، ئەمەیان من دروستی ئەکەم. یەکێکی‌تر ئەڵێ: بەرهەیوانەکەشی من دروستی ئەکەم. یەکێکی‌تر ئەڵێ: سەرتەنوورەکەشی لەسەر من. بەم جۆرە هەریەکە قسەیەك ئەکەن.

کتوپڕ یەکێك لەو ناوەدا تڕێك ئەکەنێ. خێرا خاڵەحمەد هەڵئەداتێ ئەڵێ: «ئەم شوێنەشی بۆ شوێنی ئاو دەستەکەی. هەمووتان درۆ ئەکەن تەنها ئەم نەبێ [ڕاست] ئەکا».

١٠. وتی: دەمێ ساڵ بوو دڵم چووبوو لە ئەحمەدی حاجی. ئەحمەد مەگەر هەر من بزانم چ کوڕێکی شۆخوشەنگ بوو؛ لە شانزە ساڵانا ئەتوت مانگی چواردەیە. ڕەشی چاو و برۆی، سووری سەرگۆنا خڕەکەی، باریکی لێو و لووتەکەی، ئەمانە هەموو لەگەڵ ئەو لەشولارەیدا کە ئەتوت بەفری یەکشەوەیە و خوێنی دڵی منی بەسەرا ڕژاوە، شۆرشێکیان خستبووە دڵمەوە. نەشم‌ئەوێرا بیدرکێنم، ئەموت: نەوەك لێم زیز ببێ.

ڕۆژێکیان دەمەدەمی ئێوارە بوو چوومە حەمامی حاجی عەلی لە سولەیمانی. کە چوومە ژوورەوە تەماشام کرد وا ئەحمەد بە ڕووتوقووتی لەوێ خۆی ئەشوا، حەمامیش کەسی‌تری تێدا نییە. کە ئەحمەدم بەو جۆرە چاوپێ‌کەوت حەپەسام و دەستم کرد بە بیرکردنەوە بۆ ئەوە قسەیەك بدۆزمەوە لەگەڵی بکەم. هەرچەندم کرد هیچم لەبیر نەما. کتوپڕ بەبێ ئەوە ئاگام لە خۆم بێ وتم: «ئەرێ ئەحمەدگیان ئێستە نوێژەکانت ئەکەی؟»

وتی: بەڵێ.

کە ئەم قسەیەم کرد و ئەو وەڵامەم گوێ لێ‌بوو چەمۆڵەیەکم نا لەخۆم،

هەستام بەبێ ئەوە خۆم بشۆم لـە حەمامەکە هاتمـە دەرەوە. ئیتر نازانم ئەحمـەد چـی لێ‌هات؟ کـە هاتمە دەرەوە بە خۆمـم وت: «دەك قورِم دا بە دەمتا بۆ خۆت و بۆ قسـەت». لەو وەختەوە ئیتر لە داخی ئەو قسەیە هەر جینگڵ ئەدەم.

١١. دێوانەی «سێوسێنان»ـی کە ماڵیان لە «گومەتە» بوو، ڕۆژێك لە شـارەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ئاوایی گومەتە. شێخ حەمەساڵحی گومەتە لێی ئەپرسێ: دەنگوباسـی شـار چییە؟ ئەویش ئەڵێ: «یا شێخ لـە شـار بیجووێـك بدەی بە شـووتی ئەوەنـدە ئەخۆی ئەبی بـە مانگای ئاوسەوە». ئیتر شێخ ئەوەستێ.

١٢. کابرایەکـی کـورد لـە کابرایەکـی «گۆران»ـی پرسـی: کـە فێری کەرگاییـنـی بـکا. ئەویـش وتی: «برا گوریسـێك، بەرداشـێك، ئاوێنەیەك، حەیزەبوونێك و دوو کیسەڵت ئەوێ». وتی: هەی هەی ئەمانە بۆچی؟ وتی: گوریسـەکە بۆ سـەرێکی ببەستی بە بن کلکی کەرەکەوە، سـەرەکەی‌تری ببەستی بە بەرداشەکەوە و بەسەر پشـتیا هەڵیگێڕیتەوە بیخەیتە لای ملیەوە بۆ ئەوە قورسایی بەرداشەکە کلکەکەی هەڵگێڕێتەوە. ئاوێنەکەش بۆ ئەوە حەیزەبوونەکە لە بەردەم کەرەکەدا ڕاوەستێ و ئاوێنەکە بخەیتە سـەر پشـتی و ڕووی بکەیتە خۆت هەم بۆ ئەوە ئەگەر یەکێ لە پشـتەوە هـات تـۆ چـاوت لێ بێ و هـەم ئـەوەش حەیزەبوونەکە یادێکی سـەردەمی بووکێنی خۆی بکاتەوە. دوو کیسـەڵەکەش بۆ ئەوە بیانخەیتە ژێر پێت، وشـەوش بکەن کەرەکە بوەستێ، ئەگەر هات و ڕۆیشـتیش ئەمان لەگەڵی بچن بەڕێدا و تۆ بۆ خۆت هیچ نەبزویتەوە، بە ڕەحەتی بتوانی ئیشی خۆت بکەی!. (حەیزەبوون: پیرێژنە).

١٣. کابرایەك بێ‌ژنی هاری کردبوو؛ بە هەرجۆر بوو بێوەژنێکیان بۆ ساز کرد و تۆزێ تەمێی بێوەژنەکەیان کرد. بەخوا بێوەژن بێ ئینسافانە تێی بەر بوو. کوڕە وای لێ‌هات لووتت بگرتایە گیانی دەرئەچوو، هەستا ناچار ماڵەکەی بەجێ‌هێشت و ماڵەپوورێکی هەبوو چوو بۆ ئەوێ.

لە ڕێگادا تووشی کەرێك بوو، کەرە گەلێ لەم لاتتر بوو؛ چووە بن دەستیەوە و پێی وت: «ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟ تۆیش ئەچی بۆ ماڵی پوورت؟».

١٤. کابرایەك ویستی لەگەڵ ژنێکا ڕێ‌کەوێ، ئەم ئەیوت: بە چوار قۆشە و ئەو ئەیوت: بە دوو قۆشە؛ ئاخری بە سێ قۆشە ڕێ‌کەوتن. لە وەختی ئیشا کابرا بە ژنەکەی وت: ئەرێ خۆشە؟ ژنەش وتی «ئا». ئینجا کابرا وتی:

**«کەواتە بە تۆ خۆشە و بە من خۆشە**

**ئیتر بۆ چییە ئەم قۆشە قۆشە؟»**

١٥. کوڕێکی هەورامی فێر بووبوو بە نێرەکەر گاین. نێرەکەرێکیان ئەبێ ڕۆژێك خەریکی ئەبێ، دەنکە جۆیەك لەناو قنگی نێرەکەرەکەدا ئەبێ، ئەچێ بە کونی کێری هەتیوەکەدا، هەتیو زیرەی لێ بەرز ئەبێتەوە و هاوار ئەکا: «ئای تاتە مار واردمش». باوکی ئەڵێ: «ڕۆڵە جە کۆگە؟» ئەڵێ: «جە قنگو نێرەکەرەکەی وێمان، بلما بلما سەیرش کەرۆ»[1].

---

[١. ئەسڵی زمانە هەورامییەکە بەم جۆرەیە: «قنگەو نێرەهەرەکەو وێمانە!. دەی بلمێ، بلمێ تەماشەش کەرە». (هەڵەگر).]

ئیتر هەتیو ناوێرێ کێری دەرێنێ، باوکی دێت کلکی کەر هەڵئەداتەوە ئەوا کێری هەتیوەش لە قنگی نێرەکەردایە. کابرا هەرچەندە شەفتە و چیرەی ئەملاوئەولای ئەگرێتەوە چاوی بە هیچ ناکەوێ. کوڕەش هەر هاوار هاواریەتی. باوکی ئەشڵەژێ هیچی پێ نامێنێ هەر ئەوە نەبێ ئەڵێ: «ئاخر ڕۆڵە یانەت وێران بۆ جە کۆگە سەیرش کەرو؟ ماشەڵڵا مڵەماش بڕیان».

١٦. لە دێی «شەشۆ» نێرەکەرێك هەبوو ناوبانگی دەرکردبوو بۆ بەوڕەسەنی. خەڵك لە هەموو لایەکەوە ماکەریان ئەبرد لێیان چاك ئەکرد، حەقی پەڕینەکەش سێ مەجیدی بوو ئەیاندا بە خاوەنی نێرەکەرەکە. ئەم نێرەکەرەش هی ئافرەتێك بوو ناوی «ئامە» بوو. لە جوانی و نازکی لە هەموو «سیوەسیل»دا ناوی دەرکردبوو.

ڕۆژێك کابرایەکی ئەو بەرکێوە ماکەرێك ئەبا لە نێرەکەرەکەی چاك کا، خاوەنی ماکەرەکە چاوی بە ئامە ئەکەوێ دڵی کورکەی لێوە دێت و لەو کاتەدا نێرەکەرەکە ئەپەڕێتە سەر ماکەرەکە ئەیەوێ دەرگای قسە لەگەڵ ئامەدا بکاتەوە ئەڵێ: ئەوە بۆچی ئەگەر یەکێ بیەوێ ماکەری خۆی لە نێرەکەری یەکێك چاك بکا ئەبێ سێ مەجیدی بدات، کەچی ئەگەر ئەو کەسە بیەوێ بچێ بەلای ئافرەتێکەوە ئەبێ شەش مەجیدی بدا؟. ئامە هەست ئەکا کە کابرا لە کوێوە قسە ئەکا ئەڵێ: «تۆ کێرێکی وا بۆ من بێنە من دوانزە مەجیدیت ئەدەمێ!».

١٧. کابرایەکی وڵاغدار هەبوو ڕۆژێك ژنەکەی نەخۆش ئەکەوێ. ژنانی دراوسێ ئەچن بۆ هەواڵپرسینی. لەو وەختەدا یەکێ لە کەرەکانی کابرا یەرەقی ئەکا، وەکوو دەستەك هاتوچۆ ئەکا. یەکێ لە

ژنەکان بە ژنێکی هاوڕێی تەنیشتی ئەڵێ: چۆن بوو ئێستە سەرەکەی پێتا بچوایە؟ یەکێکی تریان ئەڵێ: ئەیەڕۆ کنا سەرەکەی چییە بۆچی ناڵێیت نیوەی؟ ژنە نەخۆشەکەش بە دەم ناڵەناڵەوە ئەڵێ: «بەخوا ئەگەر ژنێ ژن بێ و لەشی ساغی پێوە بێ هەموویشی قەیناکا!».

١٨. کابرایەکی کورد هەبوو ناوبانگی کێرزلی دەرکردبوو. سێ چوار ژنی هێنابوو هەموویان لە دەستی هەڵهاتبوون. بێوەژنێك ئەم حەقایەتە ئەبیسێت و ئەچێ مێردی پێ ئەکا. شەوێ کابرا ئەچێتە لای و خەریك ئەبێ گەمەوگاڵتەی لەگەڵا ئەکا. لەو کاتەدا بێوەژنەکە دەستی ئەکەوێتە سەر کڵاوەی ئەژنۆی کابرا و دەستێکی پیا دێنێت و ئەڵێ: «ئەمە بوو کێر زلەکەی تۆ؟ ناشوکری نەبێ ئەگەر نەگبەتی نەبێ جا ئەمە چییە؟».
کابرا کە ئەمە ئەبیسێ هەر خێرا ڕاست ئەبێتەوە دەرپێکەی ئەدا بە شانیا و دەرئەچێ.

١٩. کابرایەکی یابا جارێك ئەچێتە دێیەك لێی ئەپرسن: ناوت چییە؟ ئەڵێ: ئەبووجاسم. کە دائەنیشێ دەرپێی لە پێدا نابێ، تەماشا ئەکەن کێری بە قەد کێری کەرێکە. یەکێ لە خەڵکەکە ئەڵێ: ئای ماڵت بە قوڕ گیرێ ئەبووجاسم کێری چەند زلە. ئەبووجاسم لە جوابدا ئەڵێ: «یابە وەڵڵا ئەمن چاك، ئەمما یەك برا هەیە ناو ئەبووساڵح، ئەو حاڵ خراپ، لەبەر ئەوە کێر زۆر زل ناتوانێ لە ماڵ دەرچ!».

٢٠. دەروێشێکی کەڵهوڕ هەبوو کوڕێك و نێرەکەرێکی هەبوو. لەو سەرە ڕێیان ئەکەوێتە ماڵی ژنێك؛ ژنەکەش کارەکەرێك و ماکەرێکی هەبوو. شەوێ وا هاتە پێشەوە کابرای دەروێش خۆی سواری ژنەکە و کورەکەی سواری کارەکەرەکە و نێرەکەرەکەی سواری ماکەرەکە

بوون. جا کابرای دەروێش ئەیوت:

**خوایە دووری کەی چاوی بەد لێمان**

**ناحەزیش کوێر بێ شاد نەبێ پێمان**

٢١. کابرایەك لەو دەشتەتاڵە ڕۆژێك زەردەواڵە دابووی بە دەعباکەیەوە ئاوسا بوو. هاتەوە بۆ ماڵەوە بە ژنەکەی خۆی وت ـ دەستیشی گرتبوو بە دەعباکەیەوە ـ ئافرەت ئەمەیان لە بازاڕ ئەفرۆشت ئەیاندا بە هینەکەی خۆم و سەد قڕانیش. ڕووی نەبوونی ڕەش بێ! نەبوو بیکرم، هەروا وەرمگرت و هێنامەوە وتم: تۆ چاوت پێی بکەوێ بزانی چۆنە؛ ئەگەر باشە بەڵکوو قەرز و فەرزێکی بۆ بکەین و جێبەجێی کەین.

ئافرەت وتی: جا پیاوەکە ئەیەڕۆ قەرز و فەرزی بۆ چییە؟ ئەوە خشڵەکانی من هەیە بایی دووسەد قڕانیش ئەبێ، بچۆ بیدە بە خاوەنەکەی و وەرەوە. تازە عەیبە چۆن پێی ئەدەیتەوە؟!.

پیاوە پیرە خشڵی وەرگرت و لە پاش سێ چوار ڕۆژ ئاوساوییەکەی نیشتەوە و دەعبا وەکوو خۆی لێ هاتەوە. ڕۆژێك بە هەڵەداوان هاتەوە و کردی بە ژوورا وتی: ئافرەت! هەر خوا ڕەحمی پێ کردم وتی: چی بووە؟ وتی: ئەو کێرە کە هێنابوومەوە بە دزیەتی دەرچوو. گرتمیان و بردمیان بۆلای قازی. بە هەزار دەست ماچ‌کردن و ئەملاوئەولا سەد قڕانم دا و کێرەکەم پێ‌دانەوە. ئەوانیش کێرە کۆنەکەی خۆمیان پێ دامەوە. هەر باش بوو ڕزگارم بوو لە دەستیان. ژنە وتی: «من خۆم هەر ڕۆژی هەوەڵ ئەمزانی ئەوە دزیەتی بوو؛ ئەگینا چۆن بەو جۆرە بە هەرزان ئەیاندا؟!»‌.

٢٢. ژنێك هەبوو لەو سەرە دوو کچی سەرەی هەبوو: گەورەکەیانی دا بە شوو. لە پاش حەفتەیەك چوو بۆ لای و حاڵ و هەواڵی لێ

پرسی: کە مێردەکەی لەگەڵیا چۆنە؟ لە پاشا لێی پرسی: ئەی لە ئیش کردنا چۆنە؟ وتی: بەخوا دایە کێرێکی وای پێوە نییە، ناشوکری نەبێ هەر ئەوەیە کە لە هیچ چاکترە. دایکیشی وتی: «ئۆف ڕۆڵە دایکت بمرێ، ئەوە میراتی دایکتە بۆت ماوەتەوە. دایکیشت لەگەڵ باوکی ڕەحمەتیتا هەر وا بێبەش بووا!».

لە پاش بەینێك کچەکەی تریشی دا بە شوو و چوو بۆ سەردانی. لێی پرسی: میردەکەت لە ئیش کردنا چۆنە؟ ئەویش وتی: «دایە پڕی ئەکاتەوە و هێشتا چوار پەنجەشی هەر ئەمێنێتەوە». دایکیشی وتی: «ئۆی ڕۆڵە خۆزیا دایکیشت لەو خێر و بێرە بەشێکی تێ کەوتایە!».

٢٣. لەو وڵاتی بلْباسەتییە هەتیوێك کچێکی بێ بن کردبوو. قازی لێی پرسی: ڕاست برۆ چۆن ئەم ئیشەت کرد؟ ئەویش وتی: «بەخوا قوربان! هەردووکمان بەرغەلمان ئەلەوەڕان و گەمەمان ئەکرد، بەگەمەوە دەرپێمان فڕێ دا، من هەر لەسەرم دانا و ئیتر سەگباب خێوە بۆ خۆی ڕۆچوو».

٢٤. کابرایەکی چاوکزی پیر، ڕۆژێك لەسەر حەوزەکەی مزگەوتی باشچاوش لە سولەیمانی دەستنوێژ ئەشوا. پیاوێك لە لایەوە بوو پێی وت: «بێقەزا بی دەستنوێژی چی ئەشۆی؟ ئەوەتە داوێنی کەواکەت پیسایی پێوەیە». کابرا وتی: کامەتە؟ پیشانی دا. ئەویش بۆنێکی کرد و وتی: «بە حەقی قورئان ئەوە چێشتی یەخنییە ئێوارە خواردوومە!».

٢٥. هەژار گێڕایەوە وتی: لە وەختی خۆیا هەندێك مەراغەیی ئەچن بۆ حەج. کە ئەگەنە وڵاتی عەرەبستانی ئەو خوارە بە کاروانی حوشتر ئەچن. لە ڕێگادا یەکێ لە حوشترەکان ئەکەوێ، دەستی

ئەدەنێ کە ڕاستی کەنەوە، لەو کاتەدا کە دەستی ئەدەنێ ئەڵێن: «یا عەلی!» کابرای حوشترەوان ئەڵێ: ئای ئەوە ئێوە کافرن؟ وەڵڵا دەسا ناتانبەم. ئەمانیش ئەڵێن: وەڵڵا برا کافر نین و موسوڵمانین. بە هەرجۆر بێ کابرای حوشترەوان ساز ئەکەنەوە. ئەمجا دەست ئەبەنەوە کە حوشتر ڕاست کەنەوە دیسانەوە ئەڵێن: «یا عەلی!» ئیتر کابرای حوشترەوان بە تەواوی ئەچێ بە ڕقا و ئەڵێ: ئێوە کافرن قەت ناتانبەم.

ئەمانیش پیاوێکی ئیختیاری کۆنەساڵیان تیا ئەبێ کە ئەزانێ ئیش وا بەو جۆرە خراپ هاتووە و لەو دەشتەدا گیریان خواردووە ئەڵێ: «ئەرێ خزمینە با بڵێین یا ئەڵڵا خۆ کافر نابین». بەم فێڵە کابرای حوشترەوان لەگەڵیان ڕێ ئەکەوێتەوە.

٢٦. مەلا سمایلی کانیسکانی سولەیمانی هەبوو وتی: ساڵێك چوومە کەرکووك لە قۆریەوە هاتم بچم بۆ بەری «قەلا»، سەیرم کرد لە گۆشەیەکی پردەکەی «خاسە»وە هەرا هەرایەك دێت. کە چاك سەیرم کرد ئەمە هی ژێر پردەکەوەیە و پیاوێك و کوڕێك دەستیان داوەتە یەخەی یەك و ئەو شوێنەش کەسی تری تێدا نییە. منیش ئەو سەردەمە کڵاوێکی سپی و مێزەرێکی سپیم دابووە دەوری و لە سەرم کردبوو. لە شتێك ئەچووم!. کوڕەکە دەستی کابرای ڕاکێشا و هاتن بۆلای من، ئیتر بەبێ ئەوە هیچ شەرم بکەن کوڕەکە وتی: با ئەم پیاوە موبارەکە شەرعمان بکا. منیش لە خەیاڵی خۆما مەسەلەیەکی شەرعییان هەیە و وتم: کوڕم چییە؟ کوڕە وتی: قوربان ئەم کابرایە پێی وتم: نیو مەجیدیم بداتێ و ئیشی خۆیم لەگەڵ بکا. هاتینە ئەم شوێنە وتمان: شوێنێکی چۆڵە و لە ڕاستیشدا چۆڵ بوو، کەسی تر نەهات هەر من و ئەو بووین. کە چاوم بە حەیتەکەی

کەوت پێم هەڵنەگیرا. بەڵام هێناومیەتە ئەم شوێنە و بە عەزیەتیش هاتووم. ئێستە هەرچەندە ئەکەم نیو مەجیدییەکەم ناداتێ. جەنابت شەرعمان بکە، هەرچی تۆ بفەرموویت من ڕازیم.

وتی: منیش ئەم شەرع کردنەم بەلاوە سەیر بوو وتم: «باوکم لە باپیرم و باپیرم لە باپیرەگەورەم و باپیرەگەورەشم لە ئیمامی "موزەنی" و ئەویش لە ئیمامی "شافیعی"یەوە ڕیوایەتێك ئەکا، کە ئەگەر ژن و پیاوێك لە شوێنێکی چۆڵ و تەریکا بوون و پەردە دادرابووەوە، مارەیی واجب ئەبێ. ئەم ئیشەی ئێوەش لەوە ئەچێ، کەوابوو پێویستە نیو مەجیدییەکەت بداتێ». وتی: کابرا ناچار نیو مەجیدییەکەی دا بە کوڕەکە و ڕووی کردە من و وتی: «قوربان وەڵڵا تا ئێستە جگە لە جەنابت گەوادێکیترم نەدیوە کە ئاوا بەم جۆرەیە ڕوایەتی ڕێکوپێك لەسەر مەزهەبی شافیعی حوکم بدا».

٢٧. هەر ئەم مەلا سمایلە گێڕایەوە وتی: جارێك هەتیوێکم تاو دا و بردمە شوێنێك وتم: یاڵڵا بۆم بکەوە. هەتیوەکە وتی: ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ من وام بیستووە کە تۆ لووسکە ئەبەیت و ئەیکێشی بەسەر خۆتا، من بەو نیازەوە هاتووم. وتی: پێم وت: «بەڵێ، بەڵێ ئیش لە منە و دەعوا لەوان. تۆ بۆم بکەوە پاشان بڕۆ چ دەعوایەکت هەیە بیکە».

٢٨. «مام ڕەسوو» هەبوو لە «مەروێ» ئەسپێکی کەحێلەی نایابی هەبوو ناوبانگی دەرکردبوو. کە لە «عەنەزە»یە، لە وڵاتانەوە ماینیان ئەبرد و لێیان چاك ئەکرد. عەزەی سولەیمانیش هەبوو بەناوبانگی ئەسپە کەحێلەی مام ڕەسووەوە ماینێکی هەبوو سواری بوو چوو بۆ مەروێ بۆ ئەوە لە ئەسپەکەی چاك بکا. کە چوو سەیری کرد مام ڕەسوو پیاوێکی

پیری گەلێ بەساڵا چووە و ناونیشانێکی لە زەمانی جوانی نەماوە. لە حەوشەکەی خۆیانا لە پەنا دیوارێکا لەبەر هەتاوەکە لێ ڕاکشاوە.

عەزە لە پاش سەلام و دانیشتن و چاك و چۆنی پێی وت: مام ڕەسوو بە ناوبانگی ئەسپە کەحێلەی تۆوە لە بەری دەشتەتاڵەوە هاتووم؛ نابێ دەست بنێی بە ڕوومەوە.

مام ڕەسوویش وتی: کاکە بەخێر بیت! بەڵام ئەو ئەسپەی کە تۆ ناوبانگت بیستووە ئێستە لەبەر پیری پەکی کەوتووە و هیچی پێ نەماوە. بڕوا ناکەم بتوانی کەڵکی لێ وەربگری. عەزە وتی: مام ڕەسوو من لە ڕێگایەکی دوورەوە هاتووم ئەگەر تۆ ڕات لەسەر بێ من ئەتوانم ئیشێکی وای لێ بکەم بتوانم ماینەکەی لێ چاك بکەم، مام ڕەسوویش وتی: برام کەیفی خۆتە.

عەزە هەستا ئەسپەکەی لە پەنا دیوارێکا بەسترابووەوە، زۆر لات بوو، هێنای دەستی کرد بە «ڕەنە و قاشاو» کردنی پاشان بە «ڕەنە»کە کەوتە لا تەڕافە و دەوروبەری ژێر سکی، تا وای لێکرد بە هەرجۆر بوو ئەسپەکە یەرەقی کرد و ماینەکەی بۆ هێنایە پێشەوە و پەڕاندی. ئیش تەواو بوو، ماڵاوایی کرد و گەڕایەوە بۆ وڵات. حەقیقەت ماینەکە ئەو ساڵە «نۆما» کەوەیەکی باشی لە ئەسپە کەحێلە هێنا.

مام ڕەسوو ژنێکی هەبوو «خافاتمی» ناو بوو. لە زەمانی «عەلی ئیحسان پاشا»وە هێنابووی، هەرچی دەوری جوانی بوو هەر لەو دەورەدا ڕایانبواردبوو؛ لە ئاهەنگی دنیا تەنیا گێڕانەوەی باسوخواسی بەزمی شەوانی ڕابوردووی دەوری جوانیی نەبێ هیچیتریان پێ نەمابوو.

خافاتم لەو وەختەدا کە عەزە بە ڕەنە و قاشاو خەریکی ئەسپە کەحێلە بوو، لە دەلاقەی ژوورەکەوە چاوی لێ بوو کە چۆن ئەسپە کەحێلە دەوری

ساڵانی ڕابوردووی بۆ هێنرایەوە!. ئەمەی بە دیارییەك زانی لە دیارییەكانی زەمانی ڕابوردووی.

زەمان هێنای و بردی، كوڕێكی «زاخە»یی لە وڵاتی بەغدا لە بۆیاغچییەكەیا «فلّچە»یەكی بۆیاغچیەتی تیا بوو، فلّچە ئەوەندە ئیشی كردبوو تەنها كۆتەرەكەی مابوو، وای لێ هاتبوو لە دڕكی دەشتەتاڵ خراپتری لێ هاتبوو.

خافاتم ڕەنە و قاشاوەكەی عەزەی كەوتەوە بیر بە هەرجۆر بوو فلّچەكۆنی لە كابرای بۆیاغچی بە یەكێ لە تاكە تارانییەكانی تەوقەسەری كڕی و قایمی كرد.

لە پاش بەینێك بە كۆتەرە فلّچەوە هات بە ویزەی لاڕان و دەوروبەری لاڕانی مام ڕەسوودا، تا وای لێكرد دەورێكی بۆ مام ڕەسوو گێڕایەوە و بە یادی جاری جارانەوە دەستیان كردە ملی یەك. ئیتر خافاتم بەم جۆرە فێر بوو بەمام ڕەسوو.

ساڵ سووڕایەوە، عەزە بە دەستووری ساڵی پار و بە ئەڵهای نۆمایەكی تری لە توخنی ئەسپە كەحێلەوە بارێ گەزۆ و بنێشتەتاڵی نا لە ماینە بۆرە و چووەوە بۆ «مەروێ» بۆ ماڵی مام ڕەسوو. كە چوو سەیری كرد مام ڕەسوو ئەو مام ڕەسووە نەماوە؛ بۆ ئاهی سوێن نووزەیەكی تیا ماوە بە تەواوی كفت بووە، ناتوانێ لە شوێنەكەی خۆی ڕاست بێتەوە.

عەزە باری دا بە زەوییا و خافاتم خێرهاتنێكی گەرمی كرد و خێرا كەوتە نان دروستكردن بۆی. چوو لە تەنیشت مام ڕەسووەوە دانیشت. مام ڕەسوو نەیناسییەوە، پرسی: فاتە ئەوە كێ بوو هات و ئەو زرمەی وڵاخە چی بوو هات؟ خافاتمیش وتی: ئەوە كاكە عەزیز بوو گەزۆ و بنێشتەتاڵی بۆ هێناوین.

مام ڕەسوو دەستێکی خستە سەر چاوی و سەیرێکی عەزەی کرد ناسییەوە. بە نووزەیەکەوە وتی: «ئەرێ باوەحیز ئەوە تۆ لەبابەکەی پاریت هاتوویتەوە؟ بکەم وە قونی بابتەوە بۆ خۆت و گەزۆ و بنێشتەتاڵت. پار فرفریچەی دەستەبوخچەت بۆ هێنابووم، ئیمساڵ چیت بۆ هێناوم؟ بە تەما نیت بە فێڵێکی‌تر ئیمساڵیش خافاتم بخەیتە سەر بەزمێکی‌تر؟ هەستە بڕۆ، نە خۆم هیچم پێ ماوە، نە ئەسپە کەحێلە؛ هەستە بڕۆ».

٢٩. لە «گەلاڵە» پیاوێك هەبوو هەرچەندە «حەسەن»ـی ناو بوو بەلام هەر بەناوی «خادم»ـەوە ناوی دەرکردبوو. ئەم خادمە لەوناوە تووتن و شتی ئەفرۆشت، ڕۆژێك کۆلکە ئاخوونێکی ولاتی «قوم» کە هاتبوو بۆ «نەجەف» و لەوێوە ئیتر فێری ئەوە بوو کە ببێ بە گەڕیدە و داوای شتی لە خەڵك ئەکرد. بەو بۆنەوە ئەم ئاخوون‌ئاغایە ڕێی ئەکەوێتە گەلاڵە و لەوێش ئەچێتە لای خادم؛ بە ناو هەندێ تووتنی لێ ئەکڕێ. لە پاشا ئەڵێ: دە هەندێکی‌تریشم بدەرێ «لەسەر کیسەی عەباس»!.

ئەم عیبارەتە شتێکە کۆلکە مەلاکانی شیعە دەرۆزەی پێوە ئەکەن، مەبەستیان بە «عەباس» عەباسی مامی پێغەمبەرەﷺ؛ واتە لەسەر حسابی ئەو ئەو شتەم بدەرێ ڕۆژی قیامەت ئەو ئەتداتەوە.

کە ئەمە بە خادم ئەڵێ، خادمیش خۆی لێ گێل ئەکا و ئەم وردە حسابانە نازانێ؛ وەیا لە ولاتی ئەوانا ئەم جۆرە شتە باوی نییە. ئەڵێ: با عەباس خۆی بێت، جگەرەیەکی لێ تێ‌کا، ئەگەر بەلایەوە خۆش بوو ئەو وەختە بۆی بەرە.

کابرای ئاخوونیش ئەڵێ: تۆ بمدەرێ دەخڵت نەبێ، ئەو وەری ئەگرێ. خادمیش ئەڵێ: بەخوا نایدەم بەڵکوو بەلایەوە خۆش نەبوو دایەوە بە

سەرما. ئاخوون ئەکەوێتە تەقەوە لە ڕووی هەڵنایە بە سەر و مێزەرە و کەش و فشێکەوە بڵێ: من سواڵت لێ ئەکەم. خادمیش ئەزانێ دنیا چ باسە، هەر بەم جۆرە ئاخوون لە کۆڵ ئەکاتەوە و پەلکێکی ناداتێ.

**٣٠.** ئینگلیزەکان تازە هاتبوونە عێراقەوە. ڕۆژێك ئینگلیزییەك لە کەرکووك ئەچێتە بازاڕ، ئەگەڕێ بەشوێن «لاستیکی کێر»دا. ئەچێتە هەر دووکانێك لە شتی وا ئەپرسێ کەس لێی تێ‌ناگا؛ بەتایبەتی ئەو سەردەمە کورد لە شتی وای هەر نەئەزانی. پیاوێکی خەڵکی ئەو «ناوشوان»ـە هەبوو «ڕەحیم»ـی ناو بوو، دووکانێکی عەتاری باشی لە کەرکووك دانابوو. کابرای ئینگلیز ئەچێتە سەر دووکانەکەی ئەو لەو شتە ئەپرسێ. نە ڕەحیم ئینگلیزی ئەزانێ و نە ئینگلیزەکەش کوردی ئەزانێ.

کابرای ئینگلیز هەرچەندە بە ئیشارەوە و بە دەست لەگەڵ ڕەحیمدا خەریك ئەبێ، ڕەحیم هیچی لێ تێ‌ناگا. لە ئەنجاما کابرای ئینگلیز دەست ئەبا «نوت»ێکی پێنج ڕووپیەیی دەردێنێ، لە بەردەمی ڕەحیمدا دایئەنێ، ئەمجا دەست ئەبا بەنەخوێنەکەی خۆیشی ئەکاتەوە کێری دەردێنێ و بە ئیشارە، ئیشارە ئەکا کە لاستیکم بۆ ئەمە ئەوێ. ڕەحیمیش هەر لە بناغەدا ئەم جۆرە شتانەی نەبیستووە تا لە ئیشارەی کابرا تێ‌بگا، بەڵکوو وا ئەزانێ ئەم کابرایە پێی ئەڵێ: وەرە گرەو بکەین لەسەر پێنج ڕووپیە بزانین کێری کاممان زلترە.

ئەویش دەست ئەبا بەنەخوێنەکەی خۆی ئەکاتەوە و کێری خۆی دەردێنێ. هی کابرا ئەپێوێ و هی خۆیشی ئەپێوێ، هێنەکەی ئەم دوو پەنجە زیاتر ئەبێ لە هی کابرای ئینگلیز. ئیتر بەبێ قسە دەست ئەبا پێنج ڕووپیەکە هەڵئەگرێ و ئەیخاتە باخەڵی و بەنەخوێنەکەی ئەبەستێتەوە.

کابرای ئینگلیز واقی وڕ ئەمێنێ، هیچی تری بۆ نامێنێتەوە تەنها ئەوە نەبێ ملی ڕێ ئەگرێ و ئەڕوا.

٣١. کابرایەکی بانەیی ئەچێتە «گەڕووس» و ئەچێتە دیواخانێك سەلام ئەکا. کابرایەکی گەڕووسی ـ کە لەوێ دانیشتبوو ـ بەم جۆرەی خوارەوە وەڵامی سەلامەکەی ئەستێنێتەوە ئەڵێ:

**عەلەیکــە ســەلام هــەوا خــوای عومــەر**

**چووخەکەت چوار چاك کونای قنگ وەدەر**

لەپاشا گەڕووسییەکە ئەچێتە دەرەوە و دێتەوە سەلام ئەکا، کابرای بانەییش بەم جۆرە وەڵامی سەلامەکەی ئەداتەوە ئەڵێ:

**عەلەیکە ســەلام دوژمنی عومەر**

**بێ خوا و بێ پیــر، توخم نێرەکەر**

٣٢. مەلا مەحموودی حاجی ڕەسووڵ گێڕایەوە وتی: مەلا حەمەمینی دێلێژەیی پیاوێکی ئێجگار لە خواترس و بەدین بوو. هاوڕێکانی هەڵیەخڵەتێنن کە دڵی بچێ لە شێخ نووری شێخ سالح. ئەویش بە زۆر وا ئەزانی کە دڵی لێ چووە، بەو فێڵە تەزبێحێکی ئەبێ لێی ئەستێنن و ئەیدەن بە شێخ نووری. لە پاش سێ چوار ڕۆژ چونکە ئیشەکە بێبناغە بوو، سەیر ئەکا دڵ لێچوونەکەی نەما. ئەچێ ملی هاوڕێکانی ئەگرێ ئەڵێ: «وەڵڵا دڵلێچوونەکەم نەما، تەزبێحەکەم بۆ لێ بسێننەوە».

هاوڕێکانیشی لەو سەردەمەدا شێخ نووری بابەعەلی، شێخ سەلامی عازەبانی و مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا ڕەسووڵ بوون.

٣٣. کابرایەکی «سیان» لەسەر ڕووبارەکەی «بەیانلوو» دەستنوێژی ئەشت. کە لێبووەوە تاکێ لە پێڵاوەکانی لە دەستی کەوت و

کەوتە ناو ڕووبارەکە و ئاوەکە بردی. خێرا ترێکی کەند و وتی: «ئەوە دەستنوێژەکەت! بێنە تاکە پێڵاوەکەم بدەرەوە».

لای وابوو ڕووبارەکە لەباتی هەقی دەستنوێژەکە پێڵاوەکەی بردووە.

٣٤. خاڵەفەندی گێڕایەوە وتی: ئەوا ڕۆژێك لە ئاودەستەکەی مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵا دەستم بە ئاو ئەگەیاند، کابرایەکی خەڵکی ئەو شارەزوورە چووە ئاودەستەکەی ئەو دیومەوە. ئاگام لێبوو میزەکەی کردە ناو حەوزی ئاودەستخانەکەوە، تەنانەت کەفاوەکەی هاتە ئەمدیو. منیش هاتمە دەرەوە چاوەڕێم کرد تا ئەویش هاتە دەرەوە وتم: کورە کابرا ئەوە تۆ چیت کرد؟ وتی: «برا چیم کرد؟ گووم کردە گوودانەکە و میزیشم کردە میزدانەکە».

٣٥. ڕۆژێ دوو سێ هاوڕێ ئەچن بۆ حەمامی «حاجی غەنی»، یەکێکیان ڕیش و سمێڵی فێری خەنە و وسمە ئەبێ. لە جامێکا خەنەی بۆ ئەگرنەوە و حەمامچییەکە بۆی ئەهێنێتە ژووری حەمامەکەوە.

هاوڕێکان ئەچن خەنەکە ئەڕێژن و گوو ئەکەنە ناو جامەکەوە. کابراکە نەختێ هەڵئەگرێ ئەیدا لە سمێڵی! بۆنی بەسەریا دێت، ئەزانێ چییە و دنیا چ باسە، ئیتر لە سمێڵی ئەکاتەوە و لە کێری هەڵئەسوێ. بانگی هاوڕێکانی ئەکا ئەڵێ: «ئەمە گووی کێیە وا بە سەر کێرمەوە؟».

٣٦. جارێك کوڕە دەوڵەمەندێکی ئاقاڵ لە بەغدا شەوێك ئەچێتەماڵێك بۆ ئیشی ناشیرین. سەرخۆش ئەبێ، لە ماڵەکە پێنسەد قرانی لە باخەڵا ئەبێ لێی ئەدزن. کە دێتەوە خزمەتکارێکی لەگەڵا بوو، ڕووی تێ ئەکا ئەڵێ: ئەوڕەحمان، تۆ ئەزانی کیسە پارەکەم پێنجسەد قرانی تیابوو لێیان دزیوم؟ ئەوڕەحمانیش ئەڵێ: ئەوا ئەچم بە شەق لێیان

ئەستێنمەوە.

ئەورەحمان ئەگاتە لای قاپی و بانگی ئەکا ئەڵێ: وەرە وەرە قەیناکا، حەقی خۆمم سەندووە، ئەورەحمان ئەڵێ: چۆن؟ ئاغە دەست ئەکا بە گیرفانیا شانەیەك، قاڵبێ سابوون و لفکەیەك دەرئەهێنێ، ئەڵێ: منیش ئەمانەم لەوان دزیوە. ئەورەحمان ئەڵێ: ئاغە جا ئەوە چییە؟ ئەڵێ: بێ ئەقڵ چلۆن ئەوە چییە؟ بەیانی کە بچن بۆ حەمام چلۆن خۆیان ئەشۆن؟ بەجارێ پەکیان ئەکەوێ.

.٣٧ دوو کابرای کورد لە دەشتێکا پێکەوە بوون، یەکێکیان تۆزێ دوور کەوتەوە، ئەوی‌تریان پرسی: ئەوە چی ئەکەی؟ وتی: «وەڵلا تۆزێ میز ئەکەم». پێی وت: «کورە وریا بە ئەوی‌تریشت نەبێ بە ڕیشەوە، ئاو نییە».

.٣٨ کابرایەك هەبوو لە چوارتا «دەروێش عەولا»ی ناو بوو. ئەم دەروێش عەولایە کچی ئەولاساری ژنی بوو. کەرێکیان هەبوو کەرەکەیان تۆپی. شەوێ کابرا لەگەڵ ژنەکەیا کەوتە ئیشی شەرعی، ژنەکە پێی ئەوت: ئاخر پیاوەکە ئێمە تاقە کەرێکمان هەبوو سەرمایەی ژیانمان بوو، تۆپی، ئێستە تۆ چۆن ئیشی وا ئەکەی؟ عەولاش هەر کوتی پێوە ئەدا و ئەیوت: «تۆپی تۆ خۆش، تۆپی تۆ خۆش».

.٣٩ هەر ئەم دەروێش عەولایە لەسەر کێشەی جۆ، سەبیلی کێشابوو، بە ئاگری سەبیلەکە خەرمانەکە سووتا بوو، ئەمجا دوور کەوتبوونەوە و سواری ژنەکەی بوو ئەیوت:

**سووتا بە کێر، سووتا بە قیر      سووتا بۆ شێخی دەستگیر**

٤٠. کابرایەك هەبوو لە هەڵەبجە ژنەکەی چووبووە لای قازییەکەی هەڵەبجە شکاتی لێکردبوو کە گوایە پیاو نییە و پیاوەتیی نەماوە، نیکاحەکەیان هەڵوەشێنێتەوە. قازی پیاوەکەی بانگ کرد و لە ڕووی ژنەکەدا لێی پرسی: کە تۆ چی ئەڵێیت؟ کابراش ـ بلامانێ ـ دەعباکەی ڕەپ کرد و خستیە دەستیەوە وتی: «قوربان! جەنابی قازی هەموو شایەت و قسەیەکم بەدەستمەوەیە و لەخزمەتتا ڕاوەستاوە». قازی وتی: «بەڕاستی شایەتی چاك و عادڵە. شەرع قەبووڵی ئەکا، بڕۆ خوشکم دەعواکەت درۆیە، ئەوا شایەتەکەی وەکوو کەر ئەزەڕێنێ».

٤١. ئاغایەکی ئەو سەرە باخەوانێکی غەریبی لە دێکەی خۆی بۆ باخی ناو کۆشکەکەی ڕاگرتبوو. باخەوانەکە ژنێکی جوانکەلانەی ژیکەڵانەی هەبوو، ئاغە دڵی پیا چووبوو. ڕۆژێك ئەچێ بەلایەوە و دەستێکی بۆ ئەبا. ژنە هیچ دەنگ ناکا و ئێوارێ بۆ میردەکەی ئەگێڕێتەوە. میردەکەش ئەڵێ: قەیناکا، بەڵام بەیانی من کە ئەچم بۆ ئاودێری باخەکە تۆ چەند نۆردووە نانێك و «جەوەنە»یەکی «دۆ» بێنە و وەرە بۆ لام، لەبەر پەنجەرەی کۆشکی ئاغادا چاوەڕێم بکە.

کابرای باخەوان ئەچێ بۆ سەر ئیش و ژنەش بەو جۆرەکە مێردەکەی پێی وتووە لە دەمەدەمی هەتاوکەوتنا ئەگاتە جێ. مێردەکەی دێت و هەردووکیان لەبەر پەنجەرەی کۆشکدا لێی دائەنیشن.

لەولاوە خانمی ئاغەژن لەناو کۆشکەکەدا پەنجەرەکەی کردۆتەوە، بەیانییە سەیری ئەو باخ و بێستانە ئەکا و چاوی بە باخەوان و ژنەکەی ئەکەوێ. کابرای باخەوانیش کە سەیری کرد وا خانم خەریکە سەیر ئەکا، هیچ خۆی نەخستە سەر ئەو دارەتانە کە کەس چاوی لێیانە، لە پێش

ئەوەدا کە نانەکە بخوا، هەستا چوو بەلای ژنەکەیەوە لە ڕوومەتی مینای و لە کارگی کەمای بەشی خۆی وەرگرت و ئەمجا دەستیان کرد بە نانودۆ خواردن، تێروپڕیان خوارد و پاش ئەوەش جارێکی تر لەگەڵ ژنەکەیا ئاوی ژیانیان نۆش کرد. ئەمجا هەستا چووەوە بۆ سەر ئاودێرییەکەی و بە ژنەکەشی وت :بچێتەوە بۆ ماڵەوە و پێشی وت: ئەگەر خانم لێی پرسی، ئەم پێی بڵێ کە ڕۆژی سێ جار ئەمە ئیشمانە.

لەولاوە خانم لەسەر کۆشکەکەوە چاوی لەم کارەساتەی ئەمان ئەبێ. لای نیوەڕۆ دێتە خوارەوە و ئەچێ بەلای ژنە باخەوانەکەوە پێی ئەڵێ: ئەرێ چەتیوا! ئەوە ئێوە چۆلەکەن وا بەو جۆرە خەریك ئەبن؟ ژنەش پێی ئەڵێ: خانم ئەوە چییە؟ ئێمە بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە بەو جۆرە دوودوو ئەکەین.

ئاغەژن لە دڵی خۆیا زۆر توورە ئەبێ، ئێوارێ کە ئاغە دێتەوە ئەچێ بەلایەوە و پێی ئەڵێ: بەزیاد نەبێ لەم ڕابواردنە کە ئێمە هەمانە! ئەو باخەوانە بە نانودۆ خواردن لەگەڵ ژنەکەیا بە هەموو جۆر گەمە و گاڵتە ئەکەن و بە هەموو جۆر ڕایئەبوێرن؛ ئێمە لەسەر ئەم هەموو ناز و نیعمەتە ـ خوا بیبڕێ! ـ هیچمان دیار نییە. سوێندم وا بێ و قورئانم وا بێ، یا ئەوەتا ئەبێ تۆیش وابی یا ئەمەتە ئەبێ تەلاقم بدەی. من ئەمە کەی ژیانە ڕایئەبوێرم؟ ئاغە وەکوو لەسەر بان بیخەنە خوارەوە ئەڵێ: ئافرەت ئەمە تۆ خەوت دیوە؟ ئەمە چی ئەڵێیت و لە کەیەکەوە وات لێهات؟ خانم ئەڵێ: قسە یەکە و نەبووە بە دوو، هەر ئەوەیە کە پێم وتیت. لە پاشا وەکوو چەندوچوون و سەودا کردن ڕێ ئەکەون کە ئەمیش لەشەو و ڕۆژێکدا سێ جار لەگەڵ خانمدا ئەم ئیشە خۆشە بکەن.

دەست لە دەست و قەوەت لە خوا ئەو شەوە بە هەرجۆر بوو، تا

بەیانی دوویان کرد. وتی: ئافرەت یەکێکی با قەرز بێ بەسەرمەوە.

کەکەوتە ڕۆژی سێیەم باخەوانەکە بە ژنەکەی خۆی وت: هەستە جوان و پوخت خۆت بڕازێنەوە بچۆ بەلای ئاغەمەوە. ژنەش وەکوو مێردەکەی پێی وتبوو، خۆی کرد بە گوڵی ئاڵوواڵای بەهار، بە لەنجەولارێکەوە چوو بەلای ئاغەیەوە و خۆی تێهەڵسوو. ئاغە سرکەیەکی کرد وتی: «بچۆ بەولاوە بێ‌فەڕەی ژان بە خەڵکی کەرە، ئەو وەختە قەرزار نەبووم، نەئەهاتی بەلامەوە، ئێستە کە بووم بە ژێر قەرزەوە خۆتم تێهەڵئەسووی؟ هەستە بڕۆ، هەستە داوێکی‌ترم بۆ مەنێرەوە».

ژنە هاتەوە کارەساتەکەی بۆ مێردەکەی گێڕایەوە. میردە وتی: «ئاغەگیان ئاوا چارت ئەکەم».

**٤٢.** دوکتۆر کاوس قەفتان گێڕایەوە وتی: ئاغەواتی شیوەگەلی و پشدەری دوژمنایەتییان هەبوو. دوایی بۆ ئەوە ئاشت ببنەوە ئاغەیەکی پشدەری «حەمەڕەشیاغا»ی «نۆرگ» بانگ ئەکات. حەمەڕەشیاغا برایەکی شێتۆکەی ئەبێ «سمایلاغا»ی ناو ئەبێت، زۆر لە کاکی ئەکا کە نەچن بۆ ئەو بانگکردنە؛ چونکە تەڵەیە بۆیان نراوەتەوە. ئەوانیش گاڵتەیان بە قسەی شێتۆکەیەکی وەها دێت و ئەڕۆن.

لە ڕاستیشدا پشدەرییەکان نیازیان خراپ بووە. شتەکەشیان وا داناوە کە کاتێك حەمەڕەشیاغا ئەچێت بۆ نوێژ، یەکێك لە پیاوەکانی ئەمان شەڕ بە پیاوێکی ئەوان بفرۆشێت. کە حەمەڕەشیاغا و پیاوەکانی بگرن و باڵبەستیان بکەن.

دەستەی حەمەڕەشیاغا کە ئەچن و لە ژێر کەپردا دائەنیشن، بەخێراتنێکی زۆر ئەکرێن، هەموویان تفەنگەکانیان دائەنێن، تەنیا سمایلاغا نەبێ کە لەسەر کۆشی دایئەنێت. ئەوانیش سمایلاغا ئەناسن و سڵی لێ

ناکەنەوە و بە هیچی ئەزانن. حەمەڕەشیاغا ئەچێ بۆ نوێژ و لەو کاتەدا دەنگی پیاوەکەی ئاغەی پشدەری بەرز ئەبێتەوە وەکوو دانراوە. ئاغەی پشدەری خێرا فەرمان ئەدا ئادەی هەموویان دەستبەست بکەن. لەم قسەیەدا ئەبێت و ئەیەوێ هەستێ، ئەگاتە سەر چۆك و ناگا سمایلاغا لوولەی تفەنگی ئاراستە ئەکات و ئەڵێ: «سێ‌بەسێ تەلاقم کەوتبێ هەستی ئەتکوژم، دانیشی ئەتکوژم». کابرا وەکوو قوتەی مل نێرگە کاردوو بەو جۆرە وشك ڕائەوەستێ.

جارێ حەمەڕەشیاغا و ئەوان بەم جۆرە ڕزگاریان ئەبێت، ئەمجا ئەمێنێتەوە سەر سمایلاغاو کابرا. سمایلاغا لوولەی تفەنگی ئاڕاستەی کردووە. کابرا نە ئەوێرێ هەستێ، نە ئەوێرێ دانیشێ، قوت لەو ناوەدا بۆ خۆی لەسەر نیمچەچۆك وەستاوە، هەر بجووڵێتەوە سمایلاغا ئەیکوژێ. تەنگوچەڵەمە لێرەدا ڕووی دا سمایلاغا تەلاقی خواردووە، ئەم تەلاقەی ئەم وەختێ ناکەوێ کە کابرا یا هەستێ یا دانیشێ، ئەم بیکوژێ. کابرایش ئەوا هەر بەو جۆرە ماوەتەوە. قاچی شل ئەبێ، هەندێ تەختە و شتە ئەدەنە ژێر کابرا بۆ ئەوە دانەنیشێ، چونکە کە دانیشت سمایلاغا ئەیکوژێ. سمایلاغاش لەبەر تەلاقەکەی خۆی وشك بە تفەنگەکەوە ڕاوەستاوە، دەستی لە کارایە.

ناچار پەلاماری «مەلا سولەیمان»ـی ماوەت ئەدەن کە چارێکیان بۆ بدۆزێتەوە بە جۆرێك نە تەلاقەکەی سمایلاغا بکەوێ و نە کابراش بکوژێ. مەلا سولەیمان کەدێت لە پاش تێفکرین فەرمان ئەدا بە چوار زەلام پەلی کابرا بگرن بە جۆرێ کە ڕاست نەبێتەوە و نەشکەوێتە سەر عەرز و لەسەر گازی پشت ڕایکێشن بەسەر عەرزەکەدا. ئەمە لەم کاتەدا دیارە پێی ئەوترێ نە هەستاوە و نە دانیشتووە، بەڵکوو ڕاکشاوە.

زەلامەکان لەسەر دەستوورەکەی مەلا سولەیمان کابرا وا لێ ئەکەن. ئەمجا بە سمایلاغاش ئەڵێ: دەتۆیش تفەنگەکەت لا بە. بەم جۆرە مەلا سولەیمان کابرای لە مردن ڕزگار کرد و تەلاقی سمایلاغاش نەکەوت.

بەڵام کابرا تا ڕزگاری بوو، کاتێ کە سەیریان کرد هەموو لەشی خۆی دابوو بە گووەوە. بە کوردی گووی کردبوو بە خۆیا؛ یەکێ لە ترسی ئەوە کە سمایلاغا دەستی لە کارایە و شێتیشە کوشتی؛ یەکێ لەبەر ئەوە کە تا مەلا سولەیمان هاتبوو زۆری پێ چووبوو. بەڵێ، لەبەر ترس لەو ماوەیەدا هیچی پێ نەخورابوو، بەڵام هەرچێکیشی پێ بوو فیڕاندبووی بەخۆیا.

٤٣. ئاغەیەك لەو موکریانە خزمەتکارێکی ئەبێ، پێی ئەڵێ: مەسینەیەکی بۆ بەرێتە سەر ئاودەست. خزمەتکارەکەش ئەڵێ: «قوربان گوو دەفەرمووی؟» ئاغەکەش ئەڵێ: «نەخێر میزت عەرز ئەکەم!».

٤٤. ساڵێك ئینگلیزییەك ئەچێتە هەڵەبجە، میوانی ئەحمەدبەگی پاشا ئەبێ. ئینگلیزییەکە عومری لە ژوور شەستوپێنج ساڵانەوە بوو. قسەوباس دێتە پێشەوە؛ ئەحمەدبەگ لێی ئەپرسێ: تۆ لە وڵاتی خۆتان ژن و منداڵت هەیە؟ کابرای ئینگلیزی ئەڵێ (بەڵام زۆر بەگەرمیەوە): «هێشتا هەندێ ئیش و کاریترم ماوە، ئەبێ بچم بۆ ئەفریقیا و چەند ساڵێك لەوێ ئەمێنمەوە، پاشان لە میسریش چەند ساڵێك واجباتیترم هەیە، ئەوەش تەواو ئەکەم و ئینجا ئەگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم و ئەو وەختە ژن و ماڵ و مناڵ پێکەوە ئەنێم».

کە ئەم لە قسەکانی ئەبێتەوە ئەحمەدبەگیش ئەڵێ: «دەسا هەر سێ تەلاقی ئەم ئەحمەدموختارەکەوتبێ تۆ بیت و مناڵی خۆت ناگریتە باوەش!».

٤٥. کابرایەك لە دیوەخانێکا دانیشتبوو. دیوەخانەکە پڕ بوو، وەنەوز بردیەوە. لەوکاتەدا بایەکی زلی لێ بەر بووەوە. کتوپڕ کە چاوی کردەوە و خەڵك بەدەوریەوەیە، زۆر شەرمەزار بوو، ویستی بە هەرجۆر بووە پینەی بکا. لەبەر ئەوە وتی: «ئێوە ئەزانن من ئێستە خوالێخۆشبووی باوکمم لە خەوا چاوپێکەوت؟» کابرایەك لە کۆڕەکەدا بوو، وتی: «بەڵێ، ڕاست ئەفەرمووی، ئێمە هەموو دەنگی خوالێخۆشبووی باوکتمان بیست».

٤٦. کابرایەك ئیش و کاری هەر مردووشۆری بوو، لەبەر ئەوە کە خۆی دەعباکەی بچووك بوو هەر مردوویەك کە ئەیشۆرد، ئەویش جارێك لەگەڵیا ئەمرد؛ چونکە وانێکەکەی وەکوو هی خۆی نەئەدی و بە زلتر ئەهاتە بەرچاوی. لەبەر ئەمە هەموو دەم لە خەم و خەفەتا بوو.

پیاوێکی‌تر هەبوو «مام گورزە»ی ناو بوو. ڕۆژێك مام گورزە مرد و ئەم کابرایە چوو ششتی، سەیری کرد هەرامەکەی مام گورزە هەرامە نییە، لەندەهۆڕێکە! بە هێواشی بەبێ ئەوە کەس پێی بزانێ، چەقۆی دەرهێنا، دەعباکەی کابرای بڕی و خستیە گیرفانیەوە. پاش تەواوکردنی ئیشوکاری، چووەوە بۆماڵەوە.

ئەمجا بۆ ئەوەی بە ژنەکەی بسەلمێنێ کە خوا گەورەیە هەموو شت بکا: بچووك گەورە بکاتەوە، گەورە بچووك بکاتەوە، قادرە بەسەر هەموو شتێکا، دەستی برد سەری دەعباکەی مام گورزەی لە ژێرەوە لە عاستی بەردەمیەوە پیشانی ژنەکەی دا. ژنە کە چاوی پێکەوت. بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ وتی: «ئەیەڕۆ ئەوە مام گورزە مرد؟!».

٤٧. ئەحمەد شوکری هەبوو لە سولەیمانی، جارێك ڕێی ئەکەوێتە کرماشان. قەزاوقەدەر ڕێکی ئەخا لەگەڵ ئافرەتێکا ڕێ ئەکەوێ.

سەیر ئەکا ئافرەت «داڵەهۆ»یە. لە وەختی کارا لێی ئەپرسێ: خانم تۆ ناوت چییە؟ خانم ئەڵێ: «وسعەت خانم». ئەحمەد شوکریش ئەڵێ: کوێر بم ناوەت ئەبیەم و ناوت ئەپرسم!.

**٤٨.** کابرایەکی «سەرجووقە»ی «کرندی» بەماڵەوە بەهۆی فەرمانی میریەوە ئەکەوێتە «کەریماوا»ی سەقز و چەند ساڵێك لەوێ ئەمێنێتەوە. دۆست و ناسراو پەیدا ئەکا. کابرایەکی بەرگدروویش لە کەریماوا هەبوو ناوی «تەقی» بوو. تەقی لەگەڵ خانمی سەرجووقەدا دەستیان تیکەڵاو کردبوو. ڕۆژێك سەرجووقە وتی: «خانم! سەرجووقەیەکی وڵاتی خۆمان هاتووە، ئەمەوێ بە ناوی ئەوەوە بانگێشتنێك بکەم و چەند کەسێك لە دۆست و ناسراوەکانی کەریماواش بانگ بکەم، لەبەر ئەوە نانێکی باش دروست بکە». خانم وتی: بەڵێ باشە، بەڵام تەقی بەرگدروویش هەر دۆستمانە ئەویش بانگ کە. سەرجووقە وتی: بەڵێ.

خانم نانێکی پوختی دروست کرد و سفرە ڕاخرا. سەرجووقەی میوان و میوانەکانیتر و تەقی خەیات، هەموو نانیان خوارد. پاش نان‌خواردن تەقی خەیات خۆی دزییەوە و چوو لەگەڵ خانمدا دەستی کرد بە بەزم و ئاهەنگ. سەرجووقەی مێردی خانم هەستی کرد، هەستا چوو بەشوێنیا. کە سەیری کرد وەکوو چۆن لە دڵی خۆیا وتبووی، وا بوو. پەلاماری تەقی بەرگدرووی دا کە بیگرێ، هیچ شوێنێکیتری نەهات بەدەستەوە تەنها دەعباکەی نەبێ. ئەویش لەبەر ئەوە تەڕ و لووس بوو بۆی نەگیرا. تەقی ڕای‌کرد و سەرجووقە بەشوێنیا تا گەیشتە بەر دەرگای حەوشە، هەر بۆی نەگیرا. ناچار لەبەر عەیب گەڕایەوە. کە گەڕایەوە سەیر ئەکا خانم ناوچاوی داوە بەیەکا و قسەی لەگەڵا ناکا. ئەمجا وتی: «خانم! من چ نافەرمانییەکم کردووە وا بەوجۆرە بێ‌لوتفیت لەگەڵما؟ وەکوو فەرمووت

تەقی خەیاتم بانگ کرد، نانی چەور و قەڵەوم دایە بۆ ئەوە بەهێز بێت، جەنابیشت لەگەڵی دروست بوویت، من گورزەکەیم بەدەستی خۆم پاك کردەوە، لە خزمەتیا چووم بەڕێم کرد تا بەر دەرگای حەوشە، ئەگەر سووچێکم هەیە فەرموو بیڵێ تا نەیهێڵم، ئەگەر خزمەتێکی‌ترت ماوە بفەرموو تا بە ئەنجامی بگەیەنم؛ ئەگینا ئەم بێ‌لوتفیەت بۆچی؟»!.

٤٩. کابرایەکی «نایسەر»ی دڵی بە ژنی کابرایەکی «زەنان »ییەوە ئەبێ. هەموو جار هاتوچۆی زەنانی ئەکرد و بە تەواوی بۆی ڕێ نەئەکەوت لەگەڵ یارەکەیا یەك بگرن.

ڕۆژێك ژنەکە بە کابرای دۆستەی وت: ئەگەر ئەتەوێ پێکەوە بنوین و مێردەکەشم لە ماڵەوە بێ، سبەینێ بچۆ نێرەکەرێك بێنەرە ئاوایی و بڵێ ئەیفرۆشم بە یەکێك. مێردەکەشم زۆر حەز لە نێرەکەر ئەکا بۆ کاروان، ئەو وەختە من چاری ئیشەکە ئەکەم.

کابرا بۆ سبەینێ نێرەکەرێکی پەیدا کرد و هێنایە ئاوایی و وتی: ئەم نێرەکەرە ئەفرۆشم. کابرای مێردی ژنە چوو بە لایەوە زۆر دڵی پیاچوو، وتی: بە چەندی ئەدەی؟ کابرا وتی: برا بەبێ چەندوچوون ئەیدەم بە پێشی ژنێك. کابرا هاتەوە بۆ ماڵەوە و کارەساتەکەی بۆ ژنەکەی خۆی وت. ژنە وتی: کورە ئاسانە، تۆ بیهێنە منیش ئەچم کوزەکەی دایە خەرامانی دراوسێمان بە ئەمانەت دێنم و ئەیدەمێ و نێرەکەرەکەی لە دەست دەردێنین. کابرا وتی: «یانەت وێران بۆ پەیو زیرەکیت!».

چوو کابرای کەرفرۆشی بە کەرەکەوە هێنایە ماڵەوە و ژنەکەشی چوو هینەکەی دایە خەرامانی هێنا. لەگەڵ کابرای کەرفرۆش پێکەوە نوستن و بە میردەکەشی وت: لەودیوی دەرگاکەوە دانیشە، ئاگات لە نێرەکەرەکە بێ نەوەك بڕوا. ئەمان دەستیان کرد بە ئیش و ئەویش لەو دیوەوە لە

درزی دەرگاکەوە سەیری ئیشەکەی ئەمانی ئەکرد. کابرای مێردە برایەکی هەبوو لەو کاتەدا هات و لە مەسەلەکە تێگەیشت. پێی وت: کەواتە چاك سەیر بکە، نەوەك کابرا لێی تێك بچێت. مێردە وتی: «زۆر بە پارێز سەیر ئەکەم و دڵ و چاوم تێبڕیوە، بەڵام ئەم کابرایە وا بە توندی تێی ئاخنیوە و جووتی کردووە نە ئەوی ئێمە دیارە، نە ئەوەی دایەخەرامانی دراوسێمان. ملەماش بڕیاگەن مەزانۆ چێش کەرۆ؟»!.

٥٠. ئەحەی ناسر هەبوو گۆیندە بوو. ئای ڕاست ئای درۆ، خەڵکی ئەیانوت وەیا بۆیان هەڵبەستبوو، کە هەتیوبازە. جارێك لە کەرکووك ئەنێرێ بۆ خوازبێنی ژنێك لە بەری قەڵا. ژنەش ئەڵێ: من بیستوومە کە پیاوێکی فاسق و دوابازە؛ ئەگەر واز لەمانە دێنێ قەیدی نییە، شووی پێ ئەکەم. ئەمە بە ئەحە ئەڵێنەوە. ئەحەش ئەڵێ: «بە باجی بڵێن: لە فسق‌کردن تۆبە ئەکرێ و ئاسانە، بۆ ئەوی‌تریش ئەمە بەستراوە بە لوتف و چاوەدێری ئەوەوە»!.

٥١. لە «بیجاڕ» چەند کەسێك ئەچنە لای ئاخووندێك پێی ئەڵێن: قوربان کوڕەکەی مەشتی قولی ئیشی خراپ ئەکات. ئاخووند ئەڵێ: یەکێ بە چەند ئەدا؟ ئەڵێن: یەکێ بە پێنج تمەن. ئەڵێ: ئای ئای گرانە، حەرامە.

٥٢. شەکەت بەگ گێڕایەوە وتی: لە «قەسری شیرین» ئاخووندێکی پیری نوورانی ڕوو لە حوسێنیە وەعزی ئەدا و ئەیوت: «ئەی کوڕە، ئەڕای چە سەر ڕێگا لەو دوتگەلە گرن کە ڕای مەدرسە چن؟ یە کارە، کارێکی فرە خراوە. یە گشتی ڕای کوس نییە؟ خاڵو کیرمە ناو کوس، یە ڕا وا هرا کەن؟».

**٥٣.** مەهدی عەزیز خۆشناو گێڕایەوە وتی: لە گوندێکی ئەو خۆشناوەتییە کوڕێك دڵی ئەچێ لە کچێك، بەم بەیتانەی خوارەوە ستایشی ئەکا و ئەڵێ:

ئەو حەزیزێ من دەیرێم ئەو دۆستەکەم کە دەیرێم
کە شەدەی لەسەر نایە کە لێی دەدا «قووڕابە»
چەند دەروێشی دێنە جێ دەڕوا «کەشکۆری» نابە
چەند «مەڕا»ی سەر دەرسان حەرفەکیان وەبیر نەمان
چەند حاکمی سەر تەختان هەموو ژنیان تەراق دان
سورتان ڕەشاد دەی هەنارد لۆیان بە خەرات دەنارد

کوڕە پاش ماوەیەك ئەنێرێ بۆ خوازبێنی کچەکە و کچە شووی پێ ناکات. ئەمجا لێی بازگەشت ئەبێتەوە و بەم جۆرەی خوارەوە باسی ئەکا:

کەپووت «هێرانە» قورتی تارە بنیشتی تێدایە
گێت مراکی سەپانان هێستر لەقەی لێ دایە
بژانگت کرکی کەرێ تاق و جووت ڕاوەستایە
ددانت خاکەناسە لۆ قۆرتێ چا کرایە
پەرچەم پەرکی کفرێیە بزنان دەورە لێ دایە
کەزیت پەرکی کارێیە دەریخێ وەردرایە
ڕوومەت پەرکی شفتیە مریشکان دندوك لێ دایە
بەژنت چەندە برندە هورگ پاری وێدایە
سوندەکی مەحکەم دەخۆم سەد «گوجیر»ی تێدایە
قوونت تۆقەرەی ئاشە نۆ «حەربە»ی زەرەردایە

٥٤. هەر مەهدی گێڕایەوە وتی: پیاوێك هەبوو لەو وڵاتە «لەشکری» ناو بوو. ژنەکەی بڕیاری لەگەڵ دا کە ئەو شەوە بکەن بە جەژن و بەوە پێنج هەرامان بکەن. پیاوەش وتی: ئەمری خوا و ڕەزای هەقە، کابرا خوا یاریدەی ئەدا لەباتی پێنجان هەرامە ئەکا بەشەش. ژنە ئەمەی پێ‌خۆش ئەبێ و ئەڵێ: «لەشکری خۆش لەشکری؛ قەولمان پێنج بوو، ئەو شەش کری؛ تفاقا ماڵا خۆش کری».

٥٥. مەلا سەعیدێکی ئیبنوعەباسی هەبوو، بە ڕواڵەت و سەر و ڕیش پیاوێکی نایاب بوو، بەڵام هەندێ شت ئینسان لە دەست خۆیا نییە و پیاو لە خشتە ئەبا.

جا ڕۆژێك ئەم مەلا سەعیدە لە حوجرەکەی خۆیا لە «سەقز» خەریکی کوڕێك ئەبێ، کتوپڕ کابرایەك دەرگای حوجرە ئەکاتەوە و ئەچێت بەسەر ئەو ئیشەدا. مەلا سەعید ئەڵێ: برام چیت ئەوێ؟ کابرا ئەڵێ: قوربان! هیچ ئەمویست شوێنێکم دەست کەوێ دوو ڕکات نوێژی تیا بکەم. مەلا سەعیدیش ئەڵێ: «کابرا تۆ کوێری، ئێرە کەی شوێنی ئەوەیە؟ نابینی لە بەر تەنگی شوێنەکە ئێمە دوو بە دوو سواری یەك بووین؟!.

٥٦. مەلا سمایل هەبوو خەڵکی سولەیمانی و گەڕەکی کانیسکان بوو؛ مەلای دێی «زێویە»ی بناری لای پیرەمەگرون بوو. بەڵام ئەم مەلا سمایلە خووی پێوە گرتبوو عەرەقی ئەخواردەوە و سەرخۆش ئەبوو.

ئێوارەیەك لە زێویە پێشنوێژی ئەکا و [دەست دەکات] بە چەقەنە لێدان! خەڵکەکەش هیچ، چی بڵێن. لە پاشا لێی ئەپرسن: مامۆستا ئەوە چی بوو؟ ئەویش ئەڵێ: حەدیسی شەریف ئەفەرموێ «مَنْ لَمْ يَضْرِبْ

بِاڵچەقەنە تَتَهَدَّمُ تەکیەڕووتە»؛ واتە: ئەگەر یەکێ «پل» لێ نەدا و نەیتەقێنێ، تەکیەڕووتە ئەڕووخێ. (تەکیەڕووتەش مزگەوتێکە لەناو شاری سولەیمانی).

٥٧. هەر ئەم مەلا سمایلە ڕێی ئەکەوێتە ئەو وڵاتی «زینوێ شێخی»یە زۆری برسی ئەبێ، ڕوو ئەکاتە «هۆبە»یەکی بۆڵی. لەوێ ئەبیسێ کە سەرکۆمارەکە نەخۆشە. ئەچێتە ماڵی ئەوان و ئەڵێ: من حەکیمم. زۆر بە دەوریا دێن و خزمەتی ئەکەن، پێی ئەڵێن: چارێکی ئەم نەخۆشەمان بۆ بکە. ئەویش ئەڵێ: ئاخر منیش بۆ ئەوە هاتووم.

دنیا ئێوارەوەخت ئەبێ ئەڵێ: دەستەبەرەیەك نان لەگەڵ کاسەیەك هەنگوین بێنن. ئەوانیش ئەیهێنن. پاروو پاروو نان ئەکا بە هەنگوین و کەرەکەدا و ئەیهێنێ بە دەوری سەری کابرادا و ئەیخوا و ئەڵێ: «قەزا وەگێڕ و سەدەقەی سەری ئەو بێ!» بەم جۆرە ئەکا تا تێر ئەخوا، پاشان ئەڵێ: ئەمڕۆ دەرمان کردن بەسە.

کە ئەکەونە بەیانی کابرا ئەمرێ. ئەڵێن: خۆ نەخۆشەکە مرد؟ ئەڵێ: «ئەگەر من ئەوەم نەکردایە لە پێش ئەوا من دەمردم!».

٥٨. کابرایەك لەو «ئالان»ـە باخێکی هەبوو؛ باخەکە چەند دارگوێزێکی تێدابوو. کابرا ڕۆژێك سەیری کرد توێکڵە گوێزێکی زۆر کەوتووە، بەڵام کەم بوونەوەی گوێزەکە لەچاو توێکڵەکە گەلێ زیاترە. بۆی دەرکەوت کە ئەمە ورچ پێی فێر بووە، بەتایبەتی کە گوو ورچی لەناو باخەکەدا بەرچاو کەوت، ئیتر هیچ گومانی نەما.

چوو چەند کەسێکی هێنا و خۆیان لێی داگرت. شەوێك سەیر ئەکەن ئەوا ورچێك بەسەر دارگوێزەکەوە خۆی مات داوە، دەروێشێکیش

لەولاوە کۆڵێکی باشی داگرتووە و دایناوە. مانگەشەوە، بۆیان دەرکەوت وەکوو چۆن ورچە فێر بووە دەروێشەکەیش بەو جۆرە هەر فێر بووە. دەروێشیان گرت و دەستیان کرد بە لێدانی کام لات دێشێ؛ جا دەروێشەکە ئەیوت: «ئاخر موسڵمانەکان، تۆزێ ڕەحمتان هەبێ، من لەو ورچە کەمترم وا لەمن ئەدەن و لەو نادەن؟». کابرای خاوەن باخیش ئەیوت: «باوەحیزە! ورچە فەقیرەکە ئەخوات و ئەڕێت، تۆ ئەخۆیت و ئەبەیت!)».

**٥٩.** لەو وڵاتی «کۆیە» کێخوا حەوێزی شاخەپیسکە هەبوو، ڕۆژێك هەروا پاش عەسرێك لەگەڵ مەلای گوندەکەدا ـکە مەلا نەبی ناو ئەبێ و گوندەکەش «شاخەپیسکە» ئەبێ ـ دائەنیشن و لە هەموو سووچێکەوە قسە ئەکەن. بێتاقەت ئەبن و دێنە سەر ئەوە ئەڵێن: با ژنی پاك و پیس لێك بکەینەوە.

کوێخا حەوێز ئەڵێ: مەلا نەبی چاڵێکی بچکۆلە لەبەردەمی خۆت هەڵکەنە و هەندێ وردە بەرد بگرە بە دەستەوە. من هەر ژنێکی خراپم پێ وتی، تۆ بەردێك بخەرە چاڵەکەوە و ئاوای کە، هەر ژنێکی چاکیشم پێ وتی، لەباتی ئەویش بەردێك لەملاوە دانێ. لە پاشا ئەیانژمێرین بزانین پاك زۆرترە یا پیس. مەلا نەبیش ئەڵێ: باشە.

چاڵ و بەرد ئامادە ئەکەن و ئەکەونە هەڵدان. کوێخا حەوێز ئەڵێ: ئایشە و فاتمە پاك بووە، دوو بەرد لەولاوە دانێ. مەلا نەبی دایئەنێ، پوورە خەجێ خراپ بوو، بەردێك ئاوا کەرە چاڵەکەوە. پیرۆزی خوشکم خراپ بوو بەردێك ئاوا کە. دایکم باش بوو بەردێك لەو لاوە دانێ. باجی گوڵە خراپ بوو، بەردێك ئاوا کەرە چاڵەکەوە.

سەرە دێتە سەر دایکی مەلا نەبی، ئەڵێ: دایکت خراپ بوو، بەردێك ئاواکە. مەلا نەبی ئەڵێ: کوێخا حەوێز! دایکی من؟! چۆن وا ئەڵێی؟

ئافرەتێکی چاك بوو. کوێخا حەوێز ئەڵێ: ئاوا کە پێت ئەڵێم ئاوای کە. مەلا نەبی ئەڵێ و کوێخا حەوێز ئەڵێ، لە ئەنجاما کوێخا حەوێز ئەڵێ: «مەلا ئاوای کە، هەر خۆم سێ جارم وا لێکردووە!».

٦٠. پیاوێك هەبوو لە سولەیمانی «ئەحەی نازێ»یان پێ ئەوت. دووکانی کەوچك فرۆشی هەبوو لە مەیدانی ماست فرۆشەکان.
دراوسێ دووکانێکی هەبوو تەنەکەچی بوو.
ڕۆژێك لەگەڵ کابرای تەنەکەچیدا ئەبێ بە شەڕیان، تەنەکەچی پێی ئەڵێ: ئەتکوژم و هەر تەنەکە ئەدەم لە خوێنتا. ئەحەش ئەڵێ: خەڵکینە! سەیری ئەم کابرایە ناکەن، ئەو ساڵە مانگ گیرابوو ئەم لەباتی تەنەکە لە قوزی دایکی ئەدا؛ کەچی ئێستە ئەڵێ: ئەتکوژم و تەنەکە ئەدەم لە خوێنتا!.

٦١. پیاوێك هەبوو لەو سەرە کچێکی هەبوو «مریەم»ی ناو بوو. هەموو جار لەبەر چاوی خەڵکەوە بانگی لێ ئەکرد «مریەمە».
ئەمەش بۆ ئەوە کە بەخەڵکەکە بسەلمێنێ ئەم خوێندەوارە و ئەو عالەمە کە ئەڵێن: مریەم، غەڵەتە؛ ئەبێ مریەمە بێ، چونکە مێیە. لە باوەڕی ئەوا «مریەم» ئەبێ بۆ کوڕ بێ و مریەمە بۆ کچ.

٦٢. گۆرانی کۆنی شارەزوور بە باڵای نازداراندا:

ئــەوا بەهــارە عێــل بــەرەو خــوارە
نازدار دەستیان گرت چوون بۆ تەپاڵە
ئــەو دەشــتە پڕیــە تەپاڵــە وشــکە
ژێــری تەپاڵــە مــار و دووپشــکە

دەسـتێکی بـرد بـۆ هـەوەڵ تەپاڵە
شەقەی لێ هەڵسان لەو پەنجە و خاڵە
یـەك گل زیڕانـی، دوو گل زیڕانـی
چـاوی هەڵتـەکان لـە هاوڕێکانـی
لێ گلێر بوونەوە وەك هۆری بەهەشت
شـەوقیان بڕیبوو لە دەر و لە دەشت
کەپرێکیان بۆ بەست بە دڵ و بەگیانی
چەپ چەپ ڕەیحانـە نایان لە بانی
شـەش کیسـە خەنـە بـۆ گلەبانی
دوو سـەلك سابوون بۆ سـواغ دانی

٦٣. مەلا حەسەنی شاتری بۆی گێڕامەوە وتی: حسێنی نادر هەبوو لە «مەستەکان» نوێژی ئەکرد، وتم: نوێژ ئەزانی؟ وتی: ئای گووی تۆی لـێ وارێ چـۆن نایزانـم؟ تەنها باوەحیزەکـە نەوێ. وتـم: ئەوە چییـە؟ وتـی: «کـورە نازانـم شـاتمانە، ماتمانـە؟ نازانـم چییە!» وتـم: ئەی پێغەمبەر ناوی چییە؟ وتی: «بەخوا کاورایەکی شێتی. وائەزانی نایزانم؟ حەمەی ئەولای خاڵە مستەفا».

٦٤. هەورامییەك لە هەورامییەکی ئاوەڵی ئەپرسێ: ئاخۆ ڕەزا شا چێش مـەوەرۆ؟ ئەویـش ئەڵێ: «چێـش مەوەرۆ؟ سـەرووپێ مەوەرۆ».

٦٥. کابرایەکی یۆسۆجانی کە ئەچێ بۆ کوێستان، لەو بناری «بانە»یە گایەك بار ئەکا لە «جەوت» و ئەیباتەوە. لە ڕێگادا کابرایەکی تووش ئەبێ ئەڵێ: بارەکەت چییە؟ ئەویش ئەڵێ: «برا جەوتە! جەوتە،

ئازاجەوتە، تاڵەجەوتە، جەوتی کوننە، جەوتی مەشکە، جەوتی گاوس، قەسقەوانە، هەزار خێری خواس».

٦٦. لەو خۆشناوەتییە جارێك مریشکێك ئەچێتە دیوەخانی میرەوە. میر هەرکشەی لێ ئەکا و نارِوا. یەکێك لە خوڵامەکانی میر لەوێ ئەبێ و هەر هەڵئەستێ شەقێك لە مریشك هەڵئەدا و ئەڵێ: «دایێ ما خۆت بگێم، میر بە زمانا خۆی سێ جاران فەرمووی کشە چما نارِۆی، بەخودای ئەگەر من باما هەر دەتولامەوە».

٦٧. ئۆف دڵداری، ئاخ دڵداری، یادت بەخێر دڵداری! لەو خۆشناوەتییە ئەیانەوێ ئێستر دروست بکەن، ئەمەش ئەبێ نێرەکەر ببێ بە زاوا و ماین بە بووك، تا تاقانەیەك پەیدا ببێ و ناوی بنێن ئێستری نێرەمووك.

باجی ماین هەرچەند خۆی لە نێرەکەر لووتی هەڵبسوێ شاپلیتە لە شوێنی خۆی نابزوێ؛ ناچار ماکەرێکی تازە لە بەهاری ماکەریدا ئەخەنە پێش. «نێرەکەرُالسَّلتَنە» کە چاوی بە دۆستی دێرینە و هاوسەری گیانی بکەوێ بەملادا لووشکەیەك و بەولادا لووشکەیەك، حەیتە وەکوو گورزی رۆستەم ئەکەوێتە جووڵان. کە ئیتر ئامادەی کەوان کرا، خێرا ماکەر لادرا و ماین لە شوێنی دانرا. حەیتە لە کارایە، گورز درزی دۆزییەوە، دەستەگوڵی بردەوە، ئاوی ژیان چووە زێی ماینی خۆشناوان، ماکەری بەسەزمان لەولاوە گوێ بەقەنگە لاشکی گوێ سەر بان؛ چونکە لەو رەق کرا و لە یەکێکی‌تر خرا!.

تاقانەی باوك و دایك پەیدا بوو، ناو نرا ئێستری بەچکە کەری لە ماین بوو، خوا یەکە و نەبووە بە دوو، ئەمەیە حاڵی کەر و یابوو. ئەمجا

زەماوەندە و زوڕنا و دەهۆڵ لە خۆشناوان، لە دەشت و دۆڵ، ماخۆ چما گویَ ڕەپ ئەکا؟ لە ئاش و زورگ خۆ دەر دەکا. ڕادەکێشیَ و ئەسپینداریَ، ئاخۆ دەیبا لۆ ناو شاریَ؟ کە لیَی پرسی بابات کێیە؟ دەریَ دایکم ماینی شێیە.

ئۆف دڵداری! ئاخ دڵداری! یادت بەخێر دڵداری!

٦٨. کابرایەك هەبوو لە «سەی‌ساق» دۆم بوو. ژنێکی هەبوو هەر جارە کە لیَی تووڕە ئەبوو بەو هەمانەیە ـ کەشوێنی شتوومەکەکەی بوو ـ دەستی ئەکرد بە لێدانی. ژنە زیڕەی ئەچوو بە ئاسمانا و هەر هاواری ئەکرد، وەکوو تەرزە فرمێسك بە چاویا ئەهاتە خوارەوە. خەڵکوخوا ئەچوون بە سەریا و دەستیان ئەکرد بە لۆمەکردنی ژنەکە و ئەیانوت: کچیَ خوا بتگریَ! هەمانەیەکی بۆش و خاڵی چییە وا تۆ ئەوەندە لە بەری ئەکەویتە هاوار هاوارەوە. ئەویش ئەیوت: «کورە من مشتووی ناو هەمانەکە کوشتوومی! تومەس ئەمە کابرا مشتووەکەی ئەخستە ناو هەمانەکەوە، بەوە لیَی ئەدا لە خەڵکیش وایە ئەمە هەمانەیەکی بۆشە؛ بەڵام هەر ژنەکە دەردی ئەزانی و ئەیزانی چی تیایە؟!.

٦٩. حەمەی مەلا کەریم بۆی گێڕامەوە وتی: کابرایەکی هەورامی لەلای شێخ، گوێز ئەژمیریَ. خەڵکێکی زۆریش لەویَ دانیشتبوون، کە ئەگاتە هەزار ئەڵیَ: «ئینە هەزار». کتوپڕ لەو کاتەدا ـ بلامانیَ ـ ترێك ئەکەنیَ. مەلا حسێنی مەلا قادری بیارەش لەویَ ئەبیَ هەر خێرا ئەڵیَ: «ئینە هەزارو یەوی».

٧٠. کابرایەکی هەورامی کەرێکی هەبوو، بار و شتی بۆ نەئەبرد، چوو بۆ لای شێخ دەردەدڵی کەرەکەی لا ئەکرد. ڕووی کردە

شێخ و ئەیوت: «یا شێخ! تۆ هەرە بی بارە نەبەری. یا شێخ! تۆ هەرە بی یەوە نەوەری؛ یاشێخ! تۆ هەرەبی فرمانە نەکەری؛ یا شێخ! مەزانوو تۆ چێشەنی؟» شێخیش هیچ دەنگی نەئەکرد.

٧١. مەلایەك هەبوو لەو هەورامانە لە «نەروێ» فەقێیەکی «دۆڵاو»ی لەلا بوو، دەرسی پێ ئەوت. فەقێکە زۆر ناتێگەیشتوو بوو، مەلای بەجارێ تووڕە و وەڕز کردبوو. مەلا ڕۆژێك لەسەر دەرسەکە گەیشتە تینی و کتێبەکەی فڕێدایە سەر سنگی فەقێکە و وتی: بڕۆ ئیتر من تاقەتی دەرسی تۆم نییە. فەقێش لە لەش و باردا گەلێ لە مەلاکە زلتر بوو. ئەمەی پێ ناخۆش بوو، بەتایبەتی هەندێکی‌تریش لە کۆڕەکەدا بوون، گوێیان ئەگرت. ڕووی کردە مەلا و وتی:

ئانە چێش مەکەری؟ جە ویرت مەیۆ شەوەو «لَیلَـةُ الْبارِحـه»ی لوایمێ پەی سەرقەتو «تُفاح»ی. ئەگەر من نەبیەنێ بە عەسای «مُنْحَنِيُ الرّأس»ـێوی پا لەیلە «عَضرَفوط»ی ئەکلش کەرینی؟ ئیستە «ظَهر»ت دان جیداریەوی، ماچی وەڵڵا «لاتَقرَءُ عِندي» دەرس؟!.

٧٢. کابرایەکی «بێسەری» تازە ژنی هێنابوو، شەوێ چووە لای ژنەکەی. ژنە خۆی نەئەدا بە دەستەوە. کابرا زۆر خەریك بوو، ژنە ملی نەئەهێنایە بەر بار. لە ئاخرا ڕووی کردە ژنە و وتی: «کەنیشکە وازم لێ بێرانە و خۆت بدە بە دەستەوە. وەو شێخ کەریمە ـ ڕۆحم وەقوروانی بێ ـ ئەگەر بوی وە شێخ کەریمیشەوە هەر ئەتگێم»!.

٧٣. کوڕەکەی کەمال بۆی گێڕامەوە وتی: شاگردی وەستا بووم لە «کۆیـە»، وەستام پێی وتم: ئا کوڕم! بچۆرەوە بۆ ماڵەوە بزانە چییان ئەوێ بۆیان بکڕە و بۆیان بەرەوە. منیش چووم و بە وەستاژنم

وت: ئەویش وتی: کوڕم ئەمەوێ بۆ ئەم نیوەڕۆیە یاپڕاخ بکەم، بچۆ هەندێ کەرەستەی یاپڕاخمان بۆ بێنەوە. منیش بە فڕکانێ هاتمەوە و بە وەستام وت. وەستاشم وتی: کوڕم بچۆ بۆیان بکڕە و بۆیان بەرەوە. چووم خێرا کڕیم و بردمەوە. وەستاژنم خەریکی قاپ و قاچاخ شتن بوو، دامێ و گەڕامەوە. پێی وتم: کوڕم تۆیش بۆ قاوەڵتی وەرەوە لەگەڵ منداڵەکان نان بخۆ. هاتمەوە بۆ دووکان بۆ لای وەستام.

نیوەڕۆ بە سەعاتێ پێش وادە چوومەوە سەیرم کرد وەستاژنم مەنجەڵە یاپڕاخی خستۆتە سەر ئاگر و چەند بەردێکی خستۆتە سەری بۆ ئەوەی تێك نەچێ، لەولاشەوە دەوری و فەخفوورییەکانی هەموو شتوە و لەناو سینییەکا دایناون و ناو ماڵەکەش گەسك دراوە و هەموو شت لە شوێنی خۆیایە.

لەم کاتەدا «حسام»ی کوڕی هاتەوە و وتی: دایە! برسیمە نانم بۆ تێکە. دایکیشی وتی: گیانی دایکی تۆزێ ڕاوەستە هێشتا یاپڕاخەکە نەکوڵاوە، با بکوڵێ بۆت تێ ئەکەم. ئەویش وتی: برسیمە ڕاناوەستم، هەر ئێستە بۆم تێکە. دایکی وتی: کوڕم پەلە مەکە با بکوڵی بۆت تێ ئەکەم.

لەسەر ئەمە ئەم هەر ئەڵێ و دایکیشی ئەڵێ نەکوڵاوە تۆزێ ڕاوەستە. بوو بە دەمەقاڵەیان، دایکی وتی: دە بڕۆ ملت بشکێ ئێستا نەکوڵاوە. هەر کە دایکی ئەمەی وت حیسام نەیکردە نامەردی سینییە فەخفووری هەڵگرت و دای بە عەرزا هەمووی ورد و هەراش کرد بەسەر یەکا.

لەم کاتەدا کاك سابیری برای حیسام هاتەوە کە سەیری کرد ماڵەکە شڵەژاوە و لە دایکی پرسی: ئەمە چییە و چوو بەلای ڕادیۆنەکەوە. دایکیشی کارەساتەکەی بۆ گێڕایەوە. ئەمیش لەمە تووڕەتر بوو، هەر هەڵیگرتە ڕادیۆن و دای بە زەویدا و شکاندی وتی: دیارە ئەم هەتیوەی برام شێتە.

پاش ماوەیەك وەستام هاتەوە بەسەرا و ئەمیش پرسی: ئەم هەرایە چییە؟ وەستاژنم کارەساتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش سەعاتەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و دایە بەر ڕۆژەکە و سەیری کرد وتی: خۆ هێشتا نیوسەعاتی ئەوێ بۆ نێوەڕۆ. دەستی کرد بە جنێودان بە مناڵەکان و ئەمیش لە ڕقانا سەعاتەکەی هەڵگرت و دای بە دیوارەکەدا، سەعات هەراش هەراش بوو.

وەستاژنیشم (یاحەلیم) کە ئەمەی دی سەرسام بوو، لەبەر خۆیەوە وتی: بۆم دەرکەوت کە ئێوە هەمووتان شێتن. نەیکردە نامەردی مەنجەڵە یاپراخی هەڵگرت و قلْپی کردەوە ناو حەوزەکە. هەر من مامەوە، منیش لە داخی ئەمانە و لە داخی برسێتی دەستم کرد بە سووڕان و چەقەنە لێدان و هاتمە دەرەوە!.

٧٤. سەی عەبدوڵلای «شیخ الإسلامی» هەبوو لە «سنە» پیاوێکی ئێجگار بەدین و لەخواترس بوو، دەستی مەلایەتیشی هەبوو. سوورەتی «الکهف»ـی لە قورئان لەبەر کردبوو. بە ڕۆژی هەینییان لەبەر وێڵی ئایینی، ئەیخوێند.

ڕۆژێکی جومعە، لەگەڵ دەستەیە مەلا و فەقێی سنەدا ئەچن بۆ «سەرنوێ» بۆ سەیران. ئەم تەریك لە خەڵکەکە لە پێشەوە بە ڕێگادا ئەڕوا و لەسەر عادەتەکەی خۆی سوورەتی «الکهف» ئەخوێنێ.

لەو سوورەتەدا لە دوو شوێنا ئاخری دوو ئایەت هەیە، پێشینەکەیان «سَرَبا» پاشینەکەیان «عَجَبا»یە. ماوەی بەینی ئەم دوو ئایەتەش زۆر نییە. ئەو کە تووشی ئایەتی یەکەمین ئەبێ لە باتی ئەوە بڵێ: «سَرَبا»، ئەڵێ: «عَجَبا»، کە ئەگاتە ئایەتی دووەم بە تەواوی بۆی دەرئەکەوێ کە شوێنی «عجبا» ئێرەیە و ئەزانێ لە ئەوی پێشوودا غەڵەتی کردووە.

لێرەدا لەگەڵ ئەوەشا کە ئەزانێ شوێنی «عجبا»یە و هەر ئەڵێ: «سربا». لایەك ئەکاتەوە بە دوای خۆیا و ئەڵێ: «مەردمگەل! بە شایەت بن، ئەم «سربا»ی ئەگرە لە جیاتی «عجبا» بگردکە، ئەوەی ئەینەچ لەجیاتی ئەگرەسە».

٧٥. حاجی مەلا ڕەحمانی شەرەفکەندی پیاوێکی دانسقە و وەکوو بلێیت هەر بۆ قسەی قوت داتاشرابوو. هەژار گێڕایەوە وتی:

حاجی مەلاڕەحمان ڕۆژێك لەبەر دیواری مزگەوت لەگەڵ چەند کەسێکا لەبەر بەرۆچکە دانیشتبوون، خۆیان دابووە هەتاوەکە. کەریمی فەقێ ڕەسووڵ هەبوو لەولاوە بە بۆڵەبۆڵ و جنێودان هاتە ناو خەڵکەکەوە. حاجی مەلا پرسی: ها مام کەریم! خێرە ئەوە چیت لێ قەوماوە؟ گوتی: کورە وەرە لە داخان مەمرە. داوای قەرزی خۆم ئەکەمەوە لە سەعیدی مام عەدێ، کەچی ترێکم بە «پەناباد»ێك بۆ ناکەنێ. حاجی مەلاش لە سەرخۆ وتی: «جا بابەلێ ئەگەر زۆرت پێ لازمە بۆی بکە بە دوازدە شایی!».

٧٦. شێخ عەزیز بۆی گێڕامەوە وتی: ساڵێك مافەتەیەك لە عێراق کەوتبووەوە، باو، باوی «بژی بژی» و چەپڵەبوو. خەڵك ئەیاندا لە چەپڵە و ئەیانوت: «بژی گەل، ڕۆڵەی گەل عەبدولکەریم قاسم». بەم هۆیەوە کاروباری عێراق بە تەواوی تێك چووبوو.

دوو پیاوی پەرپووتی هەژار بوون لە هەولێر، یەکێکیان ناوی «پیرداود» ئەوی‌کەیان «مارفەشەل»یان پێ ئەوت. ئەمانە لە وڵاتی هەولێر ببوون بە پێشڕەوی عالەمەکە. ڕۆژ ببوو بە ڕۆژی ئەوان.

دەستەیەکی تر کە ئەو ڕۆژانە جەوری لێ‌کردبوون، ئەمەیان بۆ پیرداود

و مارفەشەل هەڵبەستبوو، ئەیانووت:
«بڕی گەل، ڕۆڵەی گەل، پیرداود و مارفەشەل».

**.٧٧** کابرایەکی سنەیی ئەچێ بۆ مەریوان. لە مەریوان زۆرتر هەر نانی هەرزنە. کابرا لە هەرزن بەولاوە نانیتری دەست ناکەوێ بیخوا. خواردنی هەرزنیش لەسەر پێشاو دەرچوونی هەر بۆ نییە.

کابراش کە فێر نەبووە، کە ئەچێتە سەر پێشاو هەر ئەنقێنێ و هەرچەندە تین ئەداتە بەر خۆی، هیچ کەڵکێکی نادا و زۆریش بۆ تۆزێ گوو کردن نارەحەت ئەبێ. لای ئەوانیش بە هەرزن ئەڵێن: «گاڵ». جا هەر لەسەر پێشاوەکە ئەنقێنێ و ئەڵێ:

«گاڵەگیان! بەقوربانت بم، من مەریوانی نیم، خەڵکی شارم، بە مێوانی ڕێگام کەفتگەسە ئێرە. هەر چکێ سەر بێرانە دەرەوە، ئیتر ناوخۆم. گاڵەگیان گووی باوکم ئەخۆم و تۆ ناخۆم. حەفجار بێم بە دەورتا هەر چکێ بێرە دەرەوە!».



# لە باخی گوڵێک

٧٨. کابرایەکی کورد گایەکی لێ ون ببوو. ڕۆژێك لە سولەیمانی بە گەڕەکی «هۆڵێ»دا تێپەڕیم تووشی منداڵێکی هەشت نۆ ساڵان بووم حەڵوای ئەفرۆشت. سەیرم کرد ئەم منالە منالێکی‌تری گرتووە و قسەی بۆ ئەکا ئەڵێ: ئەو کابرایە کە گاکەی لێ ون بووبوو، هات بەلامەوە پێی وتم: «کوڕەکە حەڵوایەك و دوو ڕەقیتە نادەی وە دوو فلس؟ ئەرێ گایەکی بازگت نەدیگە؟»).

ژیری منالەکە و فیکر کردنەوەی لەم قسەیە گەلێ بەلامەوە جوانتر بوو لە قسەی کابرا کە کردبووی.

٧٩. کابرایەکی خۆشناوی ڕێی ئەکەوێتە ئەو ولاتی خوارە. دار خورما ئەبینێ کە هێشووی خورمای پیا شۆڕ بۆتەوە. ئەمیش زۆر دڵی بەو خورماوەیە، دەستیشی نایگاتێ. هەر لە بنەکەیا ڕائەوەستێ و سەری بۆ بەرز ئەکاتەوە و دەمی بۆ ئەتەقێنێ و ئەڵێ: «دەك لەبەرت مرم خورمێ».

٨٠. دوو کابرای هاوڕێ قسەیان کردبوو بە یەك کە چوونە هەر شوێنێك یەکێکیان درۆ بکا و ئەوی‌کەیان پینەی بکا. ئەمەیانە کردبوو بە سەرمایەی ژیان و بەڕێوەچوونیان. ڕۆژێك لە دیوەخانێکا دانیشتبوون، درۆزنەکە وتی: «ئەرێ کوڕینە! من ئیمڕۆ گوێم لێ‌بوو سەگێك لە ئاسمانەوە ئەیقووڕاند نەمزانی چی بوو؟» ئەوی‌کەشیان

وتی: «چ قەیدی هەیە بەڵکوو تووتەڵە سەگ بووبێت و قەلەڕەش بردبێتی بە ئاسمانا». کە لە دیوەخانەکە هاتنە دەرەوە پینەکەرەکە بە درۆزنەکەی وت: «ماڵ کاول تۆ درۆی عەرزی بکە، هی عاسمانیم بۆ پینە ناکرێ».

٨١. ژنێك منالێکی هەبوو میزی ئەکرد بە خۆیا، پێیان وت: بیبەرە سەر شەخس چاك ئەبێتەوە. کە بردیە سەر شەخس و هێنایەوە ئەمجا گوویشی ئەکرد بەخۆیا.

٨٢. ستاری حاجی جەبار هەبوو لە کفری لێیان ئەپرسی: چۆنی؟ ئەیوت: بچن لە «جەمە»ی ژنم بپرسن.

٨٣. ژن و مێردێك قسەیان گیرایە یەك (ئەگەر مێردەکە من نەبووبم). ژنەکە وتی: من کە هاتمە لای تۆ وەکوو گوڵ وا بووم. میردەکە وتی: «من ئێستەش هەروەکوو گوڵ وامە».

٨٤. کابرایەکی مەریوانی ئەچێ بۆ بناری بانە بۆ مازوو کردن؛ سەیر ئەکا وا دالاشێك دەست لەسەر شان کەروێشکێکی هێنا. ئەمیش خەپلەی هەرزنی ولاتی پێیە کە بە نۆردوو هێناویە بۆ ماوەی مازوو کردنەکە. پەلاماری خەپلەیەك ئەدات و ئەیگرێتە کەروێشك. خەپلە ئەدا لە گێپەڕەی ملی کەروێشکێ ئەیخا. ئەمیش ئەچێ سەری ئەبڕێ، ئەیبرژێنێ و ئەیخوا. جا ئەم بەستەیە لەسەر شێوەی ولاتی «بانە» بە خەپلەکەدا ئەڵێ:

مالــی بابم گێتلــە قوڵە        هەم تانجییە و هەم تولە
هەم تیرە هــەم کەوانە        هــەم نانی دەشــتەوانە

٨٥. پیرێژنێکی خەڵکی سولەیمانی ئەمانەی ئەوت:

چوومـە ماڵـی گاوەر  قوڵپـە قوڵپـی سـاوەر
چوومە ماڵـی جوولەکە  قوڵپـە قوڵپـی کوولەکە
چوومە ماڵـی ئەرمەنی  قوڵپە قوڵپی سـەمەنی
چوومە ماڵی موسوڵمان  دەنگی ئایەت و قورعان

٨٦. زیرەکیی زیرەکێك: کابرایەکی «تلەزەیت»ـی سێ‌بەسێ تەلاقی خواردبوو، بۆی چاك نەئەکرایەوە. ئەچێتە زەردیاوای قەرەداغ بۆلای شێخ مستەفای شێخ نەجیب، ئەو بۆی چاك ئەکاتەوە. کابرا کە تەلاقی بۆ چاك کرایەوە هەڵئەستێ بگەڕێتەوە، بەلام هەقی تەلاق چاککردنەوەکە دانانێ. شێخ مستەفا پێی ئەڵێ: کوا هەقی تەلاقەکە؟ ئەڵێ: یاشێخ! کە چوومەوە بۆت ئەنێرم. شێخ مستەفا دیسان سێ‌بەسێ تەلاقی پێ ئەخواتەوە کە تا دوو ڕۆژی‌تر هەقی تەلاقنامەکە بنێرێ.

٨٧. کوێخا قادر هەبوو خەڵکی «گڕاو»ی خۆشناو و پیاوێکی زۆر زۆر ئیختیار بوو. ئەیوت: «ئەگەر یەکێ بیەوێ لە کاروبارێکی دنیاییدا سەرکەوێ، ئەبێ دوو شتی تێدا هەبێ: یەکەم: ئەبێ چاکەی کەسی لەبەر چاو نەبێ؛ دووەم: ئەبێ تەمەنێکی زۆر درێژی هەبێ».

٨٨. مەلا حسێنی مەلا قادری بیارە وتی: ئا ئەم کوڕەم کە هەیە هەر لە منالییەوە چەتوون بوو. حەزی لە دۆکولێو زۆر ئەکردن، پێی ئەکوتا بە زەویدا بۆ دۆکولێو. ئێمەش ئەوەندەمان کردبوو لێی وەڕەز بووبووین. ڕۆژێك ئەوەندە گریا بۆی وتم: بابە ڕۆژی چوارشەممە دۆکولێو بکەن. کەوتە ڕۆژی چوارشەممە و دۆکولێو کرا و نرایە بەردەستی. ئەمجا دیسان دەستی کردەوە بە گریان و جووتە وەشاندن. وتمان: ئێستە چیت ئەوێ؟ وتی: «ئەم دۆکولێوە ناخۆم تا سوێندم بۆ نەخۆن کە

سبەینێش هەر دۆکولێو ئەکەن!».

٨٩. کابرایەکی گەڕووسی ئەچێتە «قوڕیچیا»ی «لەیلاخ» چاری نامێنێ ئەچێتە سەر بەردەنوێژەکانی مزگەوت نوێژ ئەکا. کابرای قوڕیچیایش خەریکی نوێژکردن ئەبێ، کابرای گەڕووسی «شیعە» ئەبێ و ئەم «سوننی». قوڕیچیاییەکە سەیر ئەکا کابرای گەڕووسی لە ئاخری نوێژەکەیا هەردوو بەرە لەپی دەستی دوو سێ جار ئەماڵێ بەسەر ڕانیا و بەم کردەوەیە لە نوێژ دەرئەچێ. کابرا لێی ئەپرسێ ئەوە بۆچ وا دەست ئەماڵی بەسەر ڕانتا؟ ئەویش ئەڵێ: «ئەوە یەعنی ئای لەو خیانەتە گەورەیە کە خەلافەت لە ئەمیر داگیر کرا و درا بە ئەبووبەکر».

ئەمجا ئەو لەم ئەپرسێ: ئەی تۆ بۆچ لە نوێژەکەتا لە کاتی شایەتیمانا ئەو پەنجەیەی دەستی ڕاستت، ڕاست ئەکەیتەوە؟ ئەویش ئەڵێ: «ئەوە یانێ ئەو پەنجەمە بە قنگی دایکی درۆزن».

٩٠. حافزەکانی سولەیمانی جاران کە لە مزگەوتی گەورە کۆ ئەبوونەوە، کۆڕی سەیرسەیریان ئەگێڕا. ئەوانیش لە نێوانی خۆیانا مامۆستا و سوختەیان هەبوو.

لەناو ئەوانەدا مەلا حەسەنێکی بانەیی هەبوو، ڕۆژێك لەگەڵ مەلا برایمێکی تەوێڵەییدا ئەبێ بە شەڕیان. مەلا برایم بەهێزتر ئەبێ، مەلا حەسەن ئەنێتە ژێر. مەلا حەسەن لە ژێرەوە گونی مەلا برایمی بەردەست ئەکەوێ و ئەیگرێ. بەڕاستی بێهێزی ئەکا و باقە باقی پێ ئەخا. لەوکاتەدا سوختەیەکی مەلا حەسەن ئەبێ «خولە»ی ناو ئەبێ، ئەچێ بەسەر شەڕەکەدا و ئەمیش هەر چاوی نابینێ بانگ ئەکا لە مەلا حەسەنی مامۆستای ئەڵێ: مامۆستا! لە سەرەوەی یا لە ژێرەوەی؟ مەلا

حەسەنیش ئەڵێ: «ڕۆڵە هەرچەندە لە ژێرەوەم بەڵام وەکوو لە سەرەوە بم وامە».

٩١. کابرایەك دووپشك دابووی بە کێریەوە هەر هاواری ئەکرد: کە دووپشك پێوەی داوم، ئەیانوت: داویە بە کوێتەوە؟ ئەیوت: «ناوترێ».

٩٢. کابرایەکی سوورچی بانگیان کردبوو بۆ شایەتی لەسەر کابرایەکی سووچبار. کابرا لەلای مەلا وتی: ئەمە بە شایەتی ناشێ؛ چونکە نازانێ فاتیحان بخوێنێ. مەلا بە کابرای شایەتی وت: فاتیحە بخوێنە، لە ڕاستیدا نەیزانی. مەلا وتی: ئەدی تۆ کوو نوێژان دەکەی؟ وتی: «سەیدا، لەسەر بەردی دەزانم، لەسەر حەردی نازانم». ڕاست بوو، کە ئەچووە سەر تاتە بەردەکان بەپوختی ئەیزانی.

٩٣. کابرایەکی «نژمار»ی کەرێکی هەبوو بەلایەوە زۆر کەرێکی چاك و نایاب بوو. تەڵاقی خواردبوو کە پێی نەڵێ «کەر»، هەر بە ئێستری ناوی بەرێ. ڕۆژێك کەر لە ملەی «ئەوێهەنگ»ـدا مان ئەکا و نارِوا. کابرا هەرچەندە بە دار دێتە وێزەی، هیچ کەڵکی نابێ و لە شوێنی خۆی ناجووڵێ. چاری نەمابوو ئەیوت: «سەگی سەگباب ئەگەر لەبەر تەڵاقەکە نەبوایە ناوم ئەهێنایت، ئەگینا هەر هەویت».

٩٤. مەحموودبەگی ڕەزابەگی جاف لە «کەلار» فرە قسەقوت و قسە نەستەق بوو. لە کۆڕێکا قسە لە گیانلەبەرەکانەوە ئەکرا، وتیان: کیسەڵ زۆر ئەژیت؛ سێسەد ساڵ عومر ئەکا. مەحموودبەگ هەڵیدایە وتی: «دە باشە ئێستە با بیهێنن بیکەن بە مەلاك و بە "اَقطاعی"»

ـ بە تەعبیری ئێستە ـ ئەو وەختە بتوانێ سێ ساڵ بژێت».

**٩٥.** مەلا حەمەمینە شێتە هەبوو لە سولەیمانی قسەی سەیرسەیری هەبوو: جارێك ئەچێتە چنگیان بە بن دارگوێزێکی گەورەدا تێئەپەڕێ. لەولای دارگوێزەکەوە بڕکە شووتییەك ئەبێ. بڕکە شووتی، شووتی وای گرتووە باوەشی پیا نایەتەوە. سەیری دارگوێزەکەش ئەکا گوێزی پێوەیە، هەریەکە بە قەدەر گوێزێك. سەری سووڕ ئەمێنێ ئەڵێ: «تەماشای ئەو ئەقڵە! ئەوە ئیشە؟ بڕکەشووتییەك بەو بچووکییە شووتییەکەی باوەشی پیا نایەتەوە؛ کەچی دارگوێزێك بەو گەورەییە ئەوە گوێزەکەیەتی هەریەکە ئەوەندەی تۆزێکە».

لەو کاتەدا ئەو خەریکی ئەم گێژاوەیە گوێزێك لە دارەکە ئەکەوێتە خوارەوە ئەکەوێت بەسەر سەریا تەقەی دێ. دەست ئەبا بۆ سەرسەری و ئەڵێ: «بەخوا ئەو لە من ئاقڵترە، ئەمە کە ئێستە ئەگەر شووتییەکە بوایە خۆ ئەیکوشتم!».

لە هەموو ئەم قسانەیا مەبەستی خوا ئەبێ.

**٩٦.** سۆفی پیرۆت هەبوو خەڵکی ئەو بەرکێوە بوو. نانەکەیان هەرزن بوو. لێیان پرسی: چیتان هەبوو؟ وتی: «کە چوومەوە دۆشاوی شۆکێمان هەبوو. پیرە نانم تێوە ژەند؛ کە بەرزم ئەکردەوە عاسمانە بچکۆلەی لێوە دیاربوو، کە ئەمخستە سەر زمانم ئەتوت خوڵای دەستی پێوە دەنێ».

مەبەستی تەنکی نانە هەرزنەکە بوو، ئەمەش خەریکی سەبیل تێکردن بوو، هەر ئەیوت: بەخوا خۆش بوو. پێیان وت: چی خۆش بوو؟ ئەیوت: لێم گەڕێن با سەبیلەکەم تێکەم، کە سەبیلەکەی تێکرد و مژێکی لێ دا، بەو جۆرەی وت کە وتمان.

٩٧. لەو ناو جافەتییە دوو برا و دوو خوشك چوارسەر مەڕیان ئەبێ. لەسەر بەشکردنەکەی ڕێ ناکەون. ئەیبەنە لای «مەلا مؤمن» بۆیان بەش کا. پێی ئەڵێن: لێمان بەش کە و شتێکیش بۆ خۆت هەلگرە؛ هەقی تەعوەکەت. ئەویش ئەڵێ: سێ بە سێ لێتان بەشکەم چۆنە؟ هەر لەگەڵ ناوی سێ بە سێ دێنێ زۆریان پێ خۆش ئەبێ، ئەڵێن: زۆر چاکە. ڕوو ئەکاتە دوو براکە و ئەڵێ: «ئێوە دوو ئەوەش مەڕێك، ئەوە سێ». ڕوو ئەکاتە خوشکەکە و ئەڵێ: «ئێوەش دوو، ئەوە مەڕێك ئەوە سێ». ئەمجا بۆ خۆیشی ئەڵێ: «مەڕەکان دوو منیش یەك ئەوە سێ!». بەم جۆرە بەشی ئەکا و ئەوانیش زۆر دوعای خێری بۆ ئەکەن و لێ ئەدەن ئەچنەوە هەر لایەکیان بە بەشە مەڕی خۆیانەوە.

٩٨. لە موفتی زەهاوییەوە ئەگێڕنەوە ئەڵێن: جارێك لە بەغدادا یەکێك چووە لێی پرسیوە -بەڵام لە ڕاستیدا ویستوویە بیشکێنێ- وتوویە: «جەنابی موفتی! جارێ سەگێکم چاو پێ کەوت پەڕییە سەر مەڕێك. مەڕەکە گرتی و پاشان مەڕە زا. ئەوی لەو مەڕە بووە ئایا حەڵاڵە یا حەرامە؟» موفتی وتی: «ئەتوانی بە خواردن تاقی بکەیتەوە: ئەگەر گۆشتی خوارد، ئەوە سەگە و ئەگەر گیای خوارد، ئەوە مەڕە». کابرا وتی: گۆشتیش ئەخوا و گیاش ئەخوا. موفتی وتی: بە ئاو خواردنەوەیا تاقی بکەوە: ئەگەر بە زمان ئاوی ئەخواردەوە سەگە، ئەگەر بە لێوی هەڵیئەلووشی مەڕە. کابرا وتی: هەندێ جار بە زمان و هەندێ جار بە لێو ئاو ئەخواتەوە. موفتی وتی: بە ڕۆیشتنیا تاقی بکەوە: ئەگەر لە پێش وەیا لە ناوەڕاستی ڕانەکەوە ئەڕۆیشت مەڕە، ئەگەر لە دواشەوە ئەڕۆیشت سەگە. کابرا وتی: وا هەیە لە پێشیشەوە ئەڕوا و لە دواشەوە ئەڕوا. موفتی وتی: بە دانیشتنا

تاقی بکەوە، ئەگەر لەسەر سنگ ئەکەوێ مەڕە، ئەگەر جنکە ئەکا سەگە. کابرا وتی: بە هەردوو بارا دائەنیشێ. موفتی وتی: کەواتە سەری بڕە ئەگەر ورگ (گەدەی) هەبوو مەڕە، ئەگەر ڕیخۆڵەی هەبوو سەگە.

.٩٩ شەوێك دز ئەچێتە ماڵی فایەق بێکەس لە هەڵەبجە. دزە هەرچەندە ئەگەڕێ لە کاغەزە شڕە بەولاوە هیچیتری بەرپەل ناکەوێ. دزە هەر لەبەر خۆیەوە بۆڵەی دێ. فایەقیش بەخەبەر ئەبێ، هیچ دەنگ ناکا. لە ئاخرا قاقا دەست ئەکا بە پێکەنین. دزە ڕائەچەنێ و ئیش لە ئیش ئەترازێ. ناچار ئەڵێ: مردووت مرێ بە حاڵوباڵی ماڵە جوانەکەت پێ‌ئەکەنی؟ بە چی پێ‌ئەکەنی؟ فایەقیش ئەڵێ: «مردووی خۆت مرێ! من بە ئەقڵی تۆ پێ‌ئەکەنم، ئەوەی کە من بە ڕۆژی ڕووناك ناتوانم پەیدای کەم، تۆ ئەتەوێ بە شەوی تاریك بیدۆزێتەوە؟ بڕۆ بەڕێی خۆتەوە». پاشان لێك ئاشکرا ئەبن و ئەبن بە دۆست.

.١٠٠ شێخ محەمەدی بەرزەنجی جارێك لە سولەیمانی لە مزگەوتی گەورەدا وەعزی ئەدا. شێخ مەحموود و سەی نووری و عالەمێکی زۆری لێ‌بوو. وەعزەکەی ئەو ڕۆژەی لە بابەت خراپی عەرەق خواردنەوە بوو، وتی: ئەو عالەمە چەند بێ‌ئەقڵن! بۆ کەیف و خۆشی نیو سەعات ئەچن دە قڕان ئەدۆڕێنن، ئەیدەن بە قاپێ عەرەق قوزەڵقورتی ئەکەن. «عزەت»ی فاتە لە کۆڕەکەدا بوو هەر کتوپڕ هەستا وتی: «دەسا یا شێخ! بەو مەرقەدی کاکە ئەحمەدە ئەگەر وا بێ چوار قڕانیان خەڵەتانووی؛ قاپێ عەرەقی زۆر چاك بە ڕووپیە و نیوێکە». شێخ مەحموو و ئەوان هەموو دەست ئەکەن بە پێکەنین.

١٠١. عەلی‌ئەشرەف‌خان «امیر مُعزّ»ی گەڕووسی ئەبێ بە حاکمی «سنە». کە دێتە ئەوێ بە تەنها و ڕووتوقووتی دێ. هەموو سامان و سەرمایەکەی فەرمانی قاجارییەکان بوو کە کردبوویان بە حاکمی ئەوێ. لە پاش ماوەیەك ئەمیرموعیز سامان و داراییەکی زۆری پێکەوە نا، وای لێ‌هات لە وزە دەرچوو.

«عنایت» گەڕووسیش هەبوو ئەو هەر لە سنە دائەنیشت و بووبوو بە دانیشتووی ئەوێ؛ پیاوێکی دەوڵەمەند و خاوەن پارە بوو، ئەیانوت: «سوو» ئەخوا، ئەم سامانەی لەوەوە پەیدا کردبوو (ئێمە چیمان داوە بەسەر ئەمەوە). کە ئەمیرموعیز دێ؛ ئەو گەڕووسی و ئەم گەڕووسی. عنایەت ئەوەندەی‌تر باو پەیدا ئەکا، وا دیارە قسە لەسەر ئەمیرموعیز زۆر بوو. تەماعی هاتە جۆش، گەڕووسیایەتی لە بیر چووەوە، گەڕی بە عنایەت گەڕووسیشدا ئاڵاند. هەرچییەکی هەبوو نەبوو لێی زەوت کرد. عنایەت گەڕووسی کەوتە سەر ساجی‌عەلی.

عنایەت ڕۆژێ ئەچێ بۆ لای، ئەمیرموعیز لێی ئەپرسێ: ها حاڵت چۆنە؟ عنایەت بە ناوی گەڕووسیایەتییەوە ئەڵێ: وەکوو دوێنێی تۆ وایە. ئەمیرموعیز ئەڵێ: دوێنێی من چۆن بووە؟ ئەڵێ: «وەکوو ئیمڕۆی من وا بوو». ئەمیرموعیز لە پێشا تووڕە بوو؛ لە پاشا ئەویش گەڕووسیایەتی هاتە جۆش،ماڵەکەی دایەوە.

دنیا زۆر سەیرە ئەم عنایەت گەڕووسییە لە ئاخرا ئاگر بەر بووە ماڵی و هەمووی سووتا. قوتابییەکانی مەدرەسەی «اتّحاد» بە قسەی مەلا حەسەنی شەکیبا و مامۆستاکانی‌تریان هوروژمیان برد چوون کوژاندیانەوە؛ ئەگینا گەڕەکەکە ئاگری تێ بەرئەبوو.

.١٠٢ مەلا سمایلی کانیسکان جارێك لە کەرکووك یەکێ لە گاورەکانی قەڵا دۆستی ئەبێ، ئەچێتە لای. ئەویش پەرداخێ عەرەقی بۆ دێنێ و ئەیخواتەوە. هەر لەگەڵ ئەیخواتەوە ئەڵێ: مەلا سمایل ئەزانی ئەمە عەرەق بوو؟ ئەڵێ: چی؟ بە چیا ئەزانی عەرەقە؟ ئەڵێ: پیاوێکی «ترکێف»ـیم لایە ناردمە لای ئیسحاقەجوو هێنای.

مەلا سمایلیش ئەڵێ: «بەخوا کەرە! ئێمە کە موسوڵمانەکان و عالمین، کە دێتە باسی ڕیوایەتکردنی حەدیس ئەڵێین: ئیسحاقی ڕاهەوەی لە سوفیانی سەوری و ئەو لە ئەبووهوڕەیرەوە ڕیوایەتی کردووە؛ ئێمە لەو جۆرە پیاوانە هێشتا هەر گومانمان هەیە. کەچی ئێستە ئەم ڕوایەتەم بۆ ئەکا گاورێك لە ترکێفیەکەوە و ئەو لە جوولەکەیەکەوە. بڕۆ بابە، بڕۆ بە ڕێی خۆتەوە، تێکە پەرداخێکیتر!».

.١٠٣ حەسەنبەگی جاف بۆی گێڕامەوە وتی: ئەحمەدبەگی پاشا سەروسەودایەکی تەواوی هەبوو لەگەڵ خواردنەوەدا. مەلا کەریمی پۆلیس هەبوو لە هەڵەبجە، ئەچێتە لای پێی ئەڵێ: میرم! بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ گەیشتم لە خەوا فەرمووی: با ئەحمەدموختار عەرەق کەمتر بخواتەوە.

ئەحمەدبەگیش ئەڵێ: دەسا وەڵڵا مەلا کەریم درۆ ئەکەی. مەلا کەریمیش ئەڵێ: چۆن میرم؟ ئەڵێ: «عەرەق کەم و زۆری حەرامە؛ پێغەمبەر چۆن ئەفەرموێ کەمتر بخواتەوە؟» مەلا کەریم ئیتر هیچی پێ نامێنێ.

.١٠٤ مەلایەك هەبوو مەلا حەسەنی خینديیان پێ ئەوت. هاتە لام وتی: گوێم زۆر گران بووە، بە زەحمەت گوێم لە شت

ئەبێ. گوێ گران بوونەکەم قەیناکا، بەڵام ئەوەم زۆر پێ ناخۆشە خەڵك پێم ئەڵێن: ئەمە لەبەر پیرییە. لەگەڵ ئەوەدا وا نییە؛ چونکە زۆر کەسی‌تر هەیە لە من پیرترە کەچی گوێیشی هیچ گران نەبووە. ئەترسم ئەم قسەی ئەوانە کار بکاتە سەر فرمانەکەم و بەر تەقاویتم خەن. منیش پێم وت: «گوێ مەدەرێ، گوێت لە هەموو شت ببێ، تەنها قسەیە نەبێ کە ئەڵێن: لەبەر پیری گوێت وای لێهاتووە». وتی: باشە خوا دەوامت بدا.

١٠٥. لە «سنە» وەستا فەتێ گوێزی هەشەمێزی ئەفرۆشت. «مەولوو» پیاوێکی هەژار و بێ پارە بوو، چەند جارێك بە بەر دووکانەکەی وەستا فەتێدا تێپەڕی. زۆر دڵی بە گوێزەوە بوو، بەڵام پارەی نەبوو بکڕێ. وەستا فەتێ زانی کە ئەم پیاوە زۆر دڵی بە گوێزەوەیە وتی: باوکم، وەرە ناو دووکانەکە. ئەوە چەکوش و بەرد بۆ خۆت تێر گوێز بشکێنە و بیخۆ. مەولوو چوو دەستی کرد بە گوێز شکاندن و تێری خوارد و هەستا. وەستا فەتێ وتی: مەولوو ئەگەر پارەت نییە بمدەیتێ دوعایەکی خێرم بۆ بکە. مەولوویش وتی: «وەستا فەتێ ئەگەر تۆ کەڕیت گوێت لەم تەقە تەقە نییە، خوا کەڕ نییە و گوێی لێیە».

١٠٦. ساڵێك لە سولەیمانی بێبارانییەکی خراپ دەستی پێ‌کرد. خەڵکەکە کەوتنە نوێژەبارانە و چوونە دەرەوە بۆ قەراخ شار. «ئەحەی جاو»یشیان لەگەڵ خۆیان بردبوو. بۆ نوێژەبارانە مناڵ و پیر و حەیواناتیش ئەبەن. مناڵەکان لە پێشەوە بوون، ئەحەی جاو ئەپرسێ لە شێخ بابەعەلی: کە ئەم مناڵانەی بۆ چییە؟ شێخ بابەعەلیش ئەڵێ: ئەمانە مناڵ و بێ‌گوناحن، دوعایان قەبووڵە، بەڵکوو بە دوعای ئەمانە خوا

باران بباریٚنیٚ. ئەحەی جاویش ئەڵیٚ: «یا شێخ بچۆ بەولاوە، ئەگەر بە دوعای ئەمانە بوایە تا ئێستە موعەللم و مامۆستایەك نەئەما لەسەر ئەرزا!. برۆ، با خۆمان بیٚ ئەقڵەکان بچین باشترە!».

.١٠٧ لە وەختی خۆیا تەوفیق وەهبی کۆڕێکی دروست کردبوو لە بەغدا، دەرزی کوردی بەو کەسانە ئەوت کە کوردی نازانن. یەکیٚ لەو کەسانە عەبدولمەجید ناوێك بوو کە پێیان ئەوت «ابوکمال». ئەم ئەبووکەماڵە مودیری مەدرەسە و عەرەبییەکی باشی ئەزانی. لە ئابوونەی دائیمی بوو بۆلای تەوفیق وەهبی؛ لە هەمان کاتا هاتوچۆی دووکانەکەی وەستا بەشیریشی ئەکرد. لە هەموو ئەو ماوە دوور و درێژەی لای تەوفیق وەهبیدا چەند وشەیەکی وەکوو «بۆ پێشەوە، ترازا، ئەوەندەی‌تر، ترۆزی، گۆپکە» فێر بووبوو؛ بەڵام کە ئەیانیوت، ئەیوت: «بوو بیشەوە، ترئازا، ئەویندەی‌ترِ، ترعۆزی، گووبکە». لەگەڵ ئەمانەشا هەندیٚ لە عەرەبییەکەی خۆیشی لە بیر چووبووەوە.

ڕۆژێك بەم جۆرە کوردییە لەگەڵ وەستا بەشیرا قسەی ئەکرد. وەستا بەشیر لە وزەیا نەما وتی: «ئەبووکەماڵ هەستە بچۆرە لای وەهبی بەگ بڵیٚ: وەهبی بەگ ئەوە کوردییەکەت و عەرەبییەکەی خۆم بدەرەوە».

.١٠٨ هەر ئەم وەستا بەشیرە کاتیٚ کە باسی بابەت و کتێبێك ئەکرا ئەویش بایەکی تێی ئەکەوت ڕووی ئەکردە ئەو کەسە و ئەیوت: «تۆ بینووسە و من تالیفی ئەکەم».

.١٠٩ شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: ساڵی (١٩٦٣) هەموو پێخۆری ناو شاری سولەیمانی هاتبووە سەر ئەوە کە: پیاوێکی هەژار هەبوو سەبەتەیەکی دابووە بن دەستی و بانگی ئەکرد:

«پەڵپینەی جوان و گەورەی گەڵا پان. وەرن بیکرن بیخۆن بە نانی دێمیلەی مەریوانەوە، زۆر بەلەزەتە!».

١١٠. کاك ڕەشید باجەڵان گێڕایەوە وتی: شێخ محەمەدی شێخ وەسمان ـ هەزار ڕەحمەت لە قەبرەکەی بێ! ـ لە ئاوی سیروانی دابوو، ئاوەکە بواری نەئەدا دەعباکەی کەوتبووە سەر ئاوەکە. دەروێشەکان دەستیان کرد بە هاوار هاوار، کە ئای خوا ڕۆ کێری شێخ ئاو بردی. ئەویش بەدەم مەلەکردنەوە وتی: «خەم مەخۆن بنجی قایمە!».

١١١. کورد ئەڵێ:

ـ نە ماڵت لەسەر شیو بێ، نە ژنت کچەتیو بێ، نە حاکمت هەتیوچە بێ.

ـ نەخۆشی جوانان وەك دڵۆپەی باران وایە.

١١٢. پیاوێك هەبوو لە سنە، «ئا سەی حەمەسەن»ـی ناو بوو. ژنێك هەبوو هەر لەوێ «خرتێ خانم»ـی ناو بوو. ئا سەی حەمەسەن ژنی زۆر هێنابوون. ڕۆژێك ئەچێ بۆ خوازبێنی خانم، بەڵام لە پێشتر یەکتریان نەناسیبوو. ئا سەی حەمەسەن بە خرتێ خانم ئەڵێ: من چۆن بزانم تۆ ئافرەتێکی چاك و بە سەر و بەریت؟ خرتێ خانمیش ئەڵێ: ناوبانگی من دیارە؛ بچۆ لە جۆراوا و قەتارچیان، لەناو عەشرەتی مەنمی و گەڵباغی و سوورسووردا پرسیار بکە، هەموویان من ئەناسن. ئا سەی حەمەسەن ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: «لە گشتیانا شووم کردگە و گشتیانم تاقی کردگەسەوە». ئەڵێ: «کەواسە خرتێ خانم تۆ گشت ڕۆژێ لنگت بەدەس پیاگێکەوە بووگە». خرتێ خانم ئەڵێ: «ئەیەڕۆ ئا سەی حەمەسەن چۆن وا ئەیژی؟ من گشت ڕۆژێ پیاگێکم مەهار کردگە و هەوسارەکەی بەدەسمەوە بووگە».

١١٣. مەلا سالْحی کۆزەپانکە ئەچێتە گوندی «دیبەگە». دوو برا لەوێ هەبوون یەکێکیان خەتەنە ئەکرا، کەچی ئەوی‌تریان ئەگریا. مەلا سالْح پێی ئەڵێ: مردیت مرێ تۆ لۆ ئەگری؟ ئەویش ئەڵێ: «ئاخر ماملۆستا نۆرەی منیش دێ».

١١٤. مەلا سالْحی کۆزەپانکە ستایشی موحسن ئاغای دزەیی ئەکا ئەڵێ: «پیاوێکی سیاسی وایە پێشکە بگێت نایەڵێ ئاگای لە خۆی بێت».

١١٥. کابرایەك لەو وڵاتی سیوەیلە ئەچێتە سولەیمانی. جووتێ پێڵاوی ئەبێ ئەیباتە لای کابرایەکی پینەچی بۆی پینە بکا. پینەچییەکە لێی وەرئەگرێ. مەرکانەیە دەساوی لە بەردەما ئەبێ، ئەیخاتە ناو دەساوەکە و پێی ئەڵێ: سبەینێ وەرەوە بۆی. کابرا سبەینێ ئەچێتەوە سەیر ئەکا پێڵاو هەر لە مەرکانەدایە. دیسان کابرا ئەڵێ: سبەینێ. کابرای خاوەن پێڵاو ئیتر لە وزەیا نامێنێ ئەڵێ: «برام من پێڵاوم بۆ هێناوی بۆم جووت بەقیە بکەیتەوە؛ خۆ بۆم نەهێناوی فێری مەلەوانی بکەی بۆم».

١١٦. کابرایەك لەو گەڕووسە ئەچێتە لای ئاخوونێك لێی بپرسێ: کوڕی کام پێغەمبەر بووە گورگ خواردوویە؟ ئەڵێ: «ئاخووڕ! کچی کام ئەولیا بوو کە لە چاڵی سەنعان سەگەل خواردوویانە؟»
ئاخوونیش ئەڵێ: نازانم کامیانت بۆ ڕاست کەمەوە؟ ئەڵێ: «ئاخووڕ نیم ئاخوونم، ئەولیا نەبوو ئەنبیا بوو، کچ نەبوو کوڕ بوو، چاڵ نەبوو بیر بوو، سەنعان نەبوو کەنعان بوو، سەگ نەبوو گورگ بوو!».

١١٧. میری بۆتان جارێ لە ڕاو ئەبێ لەگەڵ سوارەکانا پەراکەندە ئەبێ و بە تاقە سوارە ئەکەوێتە شیوێکەوە. لەوێدا تووشی

کەرسوارێکی ڕیش سپی کەنفت ئەبێ، پێی بەملاوبەولای کەرەکەیا شۆڕ کردۆتەوە. کەرەکەش ئەوەندە بچکۆلەیە لەوانەیە خاڵەی ڕیش سپی پێی بگاتە زەوی، سەری تەکەی دێ و ئەڕوا. سەبیلە شکاوێکیش بە دەمیەوەیە هەر نەفەسی لێ ئەداْ، لەبەر دووکەڵی سەبیلەکە مووە سپییەکانی سمێڵی هەموو زەرد هەڵگەڕاون.

میر لێی ئەپرسێ: خاڵەی ڕیش سپی بۆ کوێ ئەچی؟ ئەویش نازانێ ئەمە میرە ئەڵێ: ئەچم بۆ لای میر بەڵکوو شتێکم بداتێ بیبەمەوە بۆ ماڵ و منالْم. میر ئەڵێ: جا بە چیدا ئەزانی ئەتداتێ؟ ئەڵێ: کوڕە بە هەموو کەسی داوە بە منیش هەر ئەدا؛ قابلە لە عاستی من ببێ بە جاندرمە؟!. میر سەیر ئەکا ئەمە پیاوێکی خۆشە. ئەڵێ: ماڵ وێران میر هەرکەسی بەرچاو کەوێ باج و سەرانەی لێ ئەستێنێ؛ ئێستە تۆ چۆن داوای شتی لێ ئەکەی؟ کابرا ئەڵێ: جا من چیم هەیە تا ئەو لێم بستێنێ؟ میر ئەڵێ: ئاخر قسەیە و ئەیکەن، با تۆ وا نەزانی میر شتێکە؛ دەنگی دەهۆڵ لە دوورەوە خۆشە. ئەڵێ: ئەگەر من بزانم هیچت ناداتێ و لەوانەیە باجیشت لێ بستێنێ. کابرا ئەڵێ: من ئەچم، ئەو وەختە کە زانیم وایە من شت ئەدەم بەو میرە. ئەڵێ: چی ئەدەیتێ؟ ئەڵێ: چوارپەلی کەرەکەم ئەنێرم بە قوزی دایکی. لەسەر ئەمە لێك جیا بوونەوە. میر چووەوە، گەیشتەوە بە سوارەکانی خۆی، ڕاویان تەواو کرد و گەڕایەوە.

خاڵە ڕیش سپی ئەویش وردەوردە ڕۆیشت و گەیشتە بەر کۆشکی میر. دابەزی لە کەرەکەی، کەری بەستەوە و چووە ژوورەوە لای میر. میر پێشتر ڕایسپاردبوو کە ئەگەر یەکێکی وا هات ڕێگای لێ نەگرن.

خاڵەی ڕیش سپی هاتە ژوورەوە لەو دیواخانە و کاروبارە هەر وا سەری سوڕ ما؛ قەت شتی وای نەدیبوو. سەیری میری کرد لەو سەرەوە

دانیشتووە، ناسییەوە کە ئەمە پیاوەکەیە وا لە شیوەکەدا قسەکانی لەگەڵ کرد. دیواخانیش پڕە. میر لێی پرسی: ها خاڵەی ڕیش‌سپی چیت ئەوێ؟ وتی: جەنابی میر، ماڵ و مناڵم هیچیان نییە، هاتووم بۆ ئەوە شتێکم بدەیتێ بۆیان بەرم. میر وتی: جا کێ لێرە شتی دەست ئەکەوێ، هەرکە بێتە ئەم شوێنە ئەبێ شتی لێ بسەنرێ. خاڵەی ڕیش‌سپی وتی: «جەنابی میر منیش چوارپەلی کەرەکەم حازرە وا لە دەرەوەیە». میر دەستی کرد بە پێکەنین و داستانەکەی بۆ دانیشتووەکان گێڕایەوە، پاشان ئەمری کرد خەلاتێکی زۆر زۆریان دا بە خاڵەی ڕیش‌سپی. خاڵەی ڕیش سپی وتی: «ئەمانە هەموو بۆ خۆم؟» میر وتی: بەڵێ خاڵە. وتی: بە چوارپەلی کەرەکەشمەوە؟ میر دیسان دەستی کردەوە بە پێکەنین و وتی: بەویشەوە. وتی: «هیزەیە ڕۆنیشی بەنێ با بە لووسی بڕوا».

١١٨. بەخوا سەیرە! بە واتەی واتە بێژان جگەرەکێش سێ شتی تێدا هەیە لە کەسانیترا نییە: «یەکەم: پیر نابن، دووەم: دز ناچێتە ماڵی، سێهەم: سەگ گۆشتی ناخوا؛ واتە سەگ نایخوا».

جا ئەگەر ئازای خۆت ئەم مەتەڵە هەڵێنە. ئەگەر هەڵت نەهێنا لە بەرگێکیتری ئەم کتێبەدا بەرچاوت ئەکەوێ.

١١٩. گەلێ شتی وا هەیە زانیاری داوای ئەکا کە پیاو بیانزانێ، ئەو شتانەش با ئاشنایەتی تەواویان بە کەلەپووری کوردەوە نەبێ، بەڵام بۆ زانین باشە.

یەکێ لەو شتانە ئەو پایە و دەرەجانەیە کە لەناو عالەمی گاوریدا هەیە. من بەلامەوە هەموو وەخت زانین لە نەزانین باشترە. ئەو دەرەجانەش ئەمانەن کە لە عالەمی ئایینی گاوریدا هەن و هەشت دەرەجەن:

١ ـ «شَماس»: ئەم وشەیە «سوریالی»ـیە. پایەکەی لە خوار «قسیس»ـەوەیە. مانای خادم و مجەورە.

٢ ـ «قِسّیس»: ئەمەش هەر سوریانییە، بە مەعنا پیاوی پیرە؛ بەڵام نەك هەر پیری ڕووت، بەڵکوو مەبەست ئەوەیە کە پیاوێکی پیری موبارەکی دینی و خزمەتی کاروباری کڵێسە ئەکا. دەرەجەکەی لە نێوانی «شەماس» و «ئوسقوف»ـدایە.

٣ ـ «أُسقُف»: دەرەجە دینییەکەی لە ژوور «قیسسیس» و خوار «مەترانە»وەیە.

٤ ـ «مُطران»: ئەمە لە باری ئایینی گاوریدا سەرۆکی کڵێسەیە. ئەمە لە ژوور «ئوسقوف» و لە خوار «بەتریرەك»ـەوەیە. ئەم وشەی «مەترانە» لە وشەی «مِتروپلیس»ی یۆنانییەوە وەرگیراوە؛ مەعناکەی یەعنی شاری ئەسڵی و شاری بناغەیی. کورسی مەترانیش بە عادەتی لەشاردا ئەبێ.

٥ ـ «بَطْریَرك»: ئەمە سەرۆکی هەموو سەرۆکەکانی «أساقِف»ـەیە لە ناوچەیەکی تایبەتیدا. یا تایفەیەك لە تایفەکانی گاوریدا.

٦ ـ «جاثَلیق»: ئەو ئوسقوفەی کە لە هەموو ئوسقوفەکان پێشکەوتووترە. ئەم وشەیەش دیسان یۆنانییە.

٧ ـ «کَردینال»: ئەمەش هەر لاتینییە؛ واتە پلەی هەرە بەرزی کڵێسە.

٨ ـ «پاپا»: لاتینییە؛ بەمەعنا پایەی هەرە بەرزی عالەمی گاوری و لەوە بەرزتر ئیتر نییە. پاپا جێنشینی «قدیس پِطْرُس»ـە.

.١٢٠ لە ساڵی (١٩٧٢)دا لە «دیوانیە» کابرایەك بەناو «شیال نهابە»وە یەك شاخی لەلای چەپەوە لێ ڕوابوو کوتومت وەکوو شاخی بەرانێکی بچکولە؛ ٢٠ سانتیمتر درێژ ئەبوو. سەرەکەی وەکوو شاخی بەران

چەمابووەوە لەڕەنگ و سەختیشدا هەر لە شاخی بەران ئەچوو.

١٢١. لە بەغدا لە ساڵی (١٩٧٧) لە ١٤ی تەمووز منالێك لە خەستەخانەی «الطّفل العَرَبی» هاتە دنیا دوو ددانی سپی جوانی هەبوو. بە مەرجێ منالەکەش هێشتا نۆمانگەکەی تەواو نەکردبوو، بە عەمەلیات هێنایانە دەرەوە.

١٢٢. لە ساڵی ١٨ ی هیجری لەو وڵاتی «ڕۆم»ـە ژنێك تووتەڵە سەگێکی هێنابوو. لە پاش پرس و جوابکردنێکی زۆر لێی، وتبووی: سەگی ناوە لە خۆی.

١٢٣. لە ساڵی ٣٠٠ ی هیجری لە شاری «قەرمەسین» قاترەمێچکەیەك ئاوس بووبوو، جوانووە ئێسترێکی زۆر جوانی هێنا بوو. دایك و جوانوو هەردووکیان بە ژیانێکی تەواو ژیابوون.

١٢٤. لە ساڵی (١٩٤٦) لەو ناو جافەتییە پیاوێکی دەوڵەمەند لە عەشرەتی تەرخانی ـکە حەمەی مراخانیان پێ ئەوت ـ قاترەمێچکەیەکی ئەبێ، جوانوو ئێسترێکی ئەبێ. حەمەی مراخان ئەمە بە بەدیوومی ئەزانێ، ئێستر و جوانووەکە هەردووکی ئەکوژن!.



# شەکراوی دەماخ

١٢٥. میرزا مەحمووی حەمەساڵح گێڕایەوە وتی: ئەوا تازە ترۆمبێل داهاتووە لە سولەیمانییەوە ئەهاتم بۆ بەغدا. خێزانم و خوشکی خێزانەکەم لەگەڵایە. مەندیلێکی سپیشم بەستووە بەسەرەوە. هاتین بۆ ترۆمبێل گرتن، دوو ئافرەتی‌تر چاوەڕێیان ئەکرد لە گەراجەکە بۆ ئەوە ئەوانیش بێن بۆ بەغدا. ئێمە سێ و ئەوان دوو، ئەمە پێنج. ترۆمبێلێکمان گرت و بەرەو بەغدا بەڕێ کەوتین. ترۆمبێلچییەکە چاکی لێ ئەخوڕی. هاتین هەتا گەیشتینە نزیکی دێڵتاوا. لە ڕێگەدا ترۆمبێلچییەکە مەڕێکی کرد بە ژێرەوە. ترۆمبێلێکی دەوریەی پۆلیس بەشوێنمانەوە بوو، ئەو هات پێشکەوت و چوو لە نوختەکە خەبەری دا کە ترۆمبێلێك ئێستە دێت ناو و نیشانی ئەوەیە پیاوێکی مێزەر بەسەری تێدایە مەڕێکی کردووە بەژێرەوە بیگرن.

وتی: کە چووین ترۆمبێلیان گرت و بە ترۆمبێلچییەکەیان وت: تۆ مەڕێکت کردووە بەژێرەوە ئەبێ بیبژێری. ئەویش وتی: من نیم، وتیان: قۆمیسەرەکە خەبەری لێ‌داویت ـ ترۆمبێلچییەکە سەری زمانی ئەگرت ـ وتی: ئەو قۆمیسەرە من ئەیناسم حیزە. وتیان: ئەمەی پێ ناوێ ناونیشانەکەی ڕاستە؛ وتوویە مێزەر بەسەرێك لە ترۆمبێلەکەیایە. هیچ ترۆمبێلی‌تر نەهاتووە مێزەر بەسەری تێدابێ جگە لە تۆ نەبێ. وتی: وەڵڵا بەمە بۆڕیان دا مەڕەکەیان پێ بژارد. ڕزگار بووین ڕۆیشتین، لەو کاتەدا وتی: «هۆ مێزەر بەسەر! ئەمە مێزەرەکەی تۆیە چووە قوزی دایکمەوە».

میرزا مەحموو وتی: کە دەرچووین لەوێ دنیا گەرم بوو، جارجار مەندیلەکەم دائەگرت، وتی: جارێکیان کابرای ترۆمبێلچی ڕووی تێ‌کردم و پێ‌ وتم: «بۆچی دایئەنێی تازە دایکت گاوم ئیتر چی تیدا ماوە؟!».

١٢٦. مەلا مەحموو گێڕایەوە وتی: لەو ناو جافەتیەی بناری کفرییە پیاوێکیان چووە لای مەلاکەی زەردەلیکاو وتی: مامۆستا شەرع شەرمی بۆ نییە، خۆت ئەزانی ڕەمەزانە، ئیمشەو لەگەڵ خێزانەکەما خەریکی ئیشی خێر بووین و شەبەقی دا چارەم چییە؟ مەلا وتی: برا ئەبێ بیگێڕیتەوە. کابرا وتی: دەسا مەلا ئیمام شاسواریش بێت بنەوێ لێی تازە ناتوانێ بیگێڕێتەوە».

١٢٧. ئەنوەربەگ گێڕایەوە وتی: لە سەردەمی «مێجەرسۆن»ـدا لە سولەیمانی حاجی‌ئاغا قۆمیسەر بوو. لە پاشا وا دیاربوو مێجەرسۆن لێی توورە بووبوو قۆمیسەرییەکەی لێ سەندبووەوە. پاش ماوەیەك بە هەرجۆر بوو گەڕابووەوە بەڵام بە یەك دوو پلە کەمتر لە جاری یەکەم. ئەحمەدی عەزیزاغا و مستەفای حاجی برایماغا و هەندێکی‌تر لە دۆستەکانی ئەچنەماڵەوە بۆلای و پیرۆزبایی گەڕانەوەی لێ ئەکەن و پێشی ئەڵێن: هیچ دڵتەنگ مەبە بەوە کە بە کەمتر گەڕایتەوە. گوایە دڵی ئەدەنەوە! ئەویش ئەڵێ: «کوڕە نە وەختی خۆی و نە ئێستەش خۆ من بۆ لە دەست دەرچوونی مانگانە دلگران نەبووم و نیم؛ بەڵام دلگرانییەکەم بۆ ئەوەبوو کە ئەحمەد و مەحموودەکەم لە دەست دەرچوو بوو، وا ئێستە گەڕایەوە، ئەگینە مانگانە خۆی شتێکی وا نییە».

١٢٨. ساڵێك زوو خزمێکی ئەوڕەحمانی خامە، ماڵیان لە بەغدا ئەبێ. «پوورەفاتە»یەکی خزمیان هەبوو لە سولەیمانییەوە بە

میوانـی ئەچێت بـۆ ماڵیان. پـووره فاته ئافرەتێکی بەنوێـژ و تەعات بوو، سەری بچوایە نوێژی نەئەچوو؛ بەڵام زۆری پـێ ئەچوو لەسەر ئاودەست. خزمەکەی مامە ڕەحمانیش بەیانیان کە هەڵئەستا ئەچوو بۆ سەر ئیش ئەبوایە دەسـت و دەموچاوی بشـوا و سەرئاودەست بکا. پوورەفاتەش ئاو دەستەکەی لـێ ئەگرت هـەر دەرنەئەچوو. ئەمیش درەنگـی بوو ئەبوایە بچوایـە بـۆ سـەر ئیشـەکەی. بـە ناچـاری هـەروا ئەڕۆیشـت بەبـێ ئـەوە سەرئاودەست بکا.

ڕۆژێـك و دوو ڕۆژ و سـێ ڕۆژ وا ئـەم ئیشـە درێـژەی کێشـا. ڕۆژێك خاڵەی خزم لە ڕێگادا تەنگەتاو ئەبێ، بڕ ناکا بۆ سـەر ئیشـەکەی، هەر لـە ڕێـگا خـۆی پیـس ئـەکا. کـە ئیش گەیشـتە ئەم شـوێنە ئیتر لـە وزەیا نامێنێ. ئێوارێ کە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە شەوێ لە نیوەشەوا هەڵئەستێ هەنـدێ دەلوبیبـەری هاڕاوە لەگـەل ئاڵـەت و زەنجەفیڵدا تێکەڵاو ئەکا و ئەیبا ئەیکاتە ناو مەسینەی ئاو دەستەکە و بەیانی لەسەر عادەتی خۆی لـێ ئـەدا ئەچێ بۆ سـەر ئیش. پوورەفاتـە وەکوو جاران زوو هەڵئەستێ ئەچێتە سـەر ئاودەسـت، کە لێ ئەبێتەوە ئاو ئەکاتە مەسینەکە و خۆی پێ ئەشوا؛ مەسینەش ئەو غەزەبەی تێدایە.

لـە پاش یـەك دوو سـەعات پوورەفاتە ئاگری تـێ بەر ئەبێ. ئەو ڕۆژە ئیـش و کاری هـەر بووبـوو بـەوە: بە دەسـت و بە کراسـەکەی باوەشـینی ناو گەڵی خۆی ئەکرد و ئەیوت: «وەی وەی بە قوڕە گیرێ! ئەم بەغدایە چەنـد گەرمـە! ئەیـەڕۆ عەتیەخـان ئـەوە ئێـوە چۆن سـتاری تیـا ئەگرن؟ وەڵڵا مـن ئەگـەر دوو ڕۆژیتـری لـێ بم بە تـەواوی ئەتوێمەوە. هەسـتن بار کەن با بچینەوە بۆ سـولەیمانی». ئاوا بە کراسەکەشـی هەر خەریکە باوەشێنی ناو گەڵی ئەکا.

١٢٩. فەتالی‌شای قاجار (١٧٧١- ١٨٣٤) -خوا سەلامەتی کا!- بە تەنها ٦٣ ساڵ عومرەوە ٤٠ دانە کوڕی هەبوو. ئەمانە هەر لە سەردەمی خۆیا وەچەیان ئەوەندە لێ کەوتەوە کار لە دووسەد و سێسەددا نەما. چ بە بەچکەشا و چ نەوە و نەوازی ئەوانە هەموو لەلەیان هەبوو؛ هەموویشیان دوای نەمانی شا، شایان بە «خاقانی مەغفوور ئەرد» ناو ئەبرد. حەسەن‌بەگی جاف گێڕایەوە وتی:

یەکێ لە کوڕەزاکانی فەتالی‌شا دوو سێ منالی هەبوو کە لە تەمەنی دە دوانزە ساڵانا بوون. ئەمانە لەلەیەکیان هەبوو لەگەڵیان بوو. خۆت ئەزانی منالی بچووك و بەتایبەتی شازادەش بێ، زۆر لاسار و چەتوون ئەبێ. ئەم منالانە دنیایان لە لەلەکەیان کردبوو بە پێستی چۆلەکە. یەکێ پەنجەی ئەکرد بە چاویا ئەیوت: بە گۆڕی خاقانی مەغفوور نەمزانی؛ یەکێ پەنجەی ئەکرد بە ژێر کڵاوەکەیا ئەیوت: بە گۆڕی خاقانی مەغفوور دەنگ ناکەی؛ یەکێ بزێکی پێوە ئەکرد، ئەیوت: بە گۆڕی خاقانی مەغفوور پەنجەم سەری کرد. بەم جۆرە لەلەی هەژاریان لە دین دەرکردبوو. لەلەش لەبەر ناو و گۆڕی خاقانی مەغفوور نەیئەوێرا هیچ دەنگ بکا.

ڕۆژێك ئەم منالانە بە تەواوی هەراسانیان کرد و ئیتر پێی هەڵنەگیرا. یەکێك لە منالەکان پەنجەی کرد بەناو ڕیشەکەیا و وتی: بە گۆڕی خاقانی مەغفوور ڕیشێکی پڕە. ئەویش هیچ سێ و دووی نەکرد و وتی: «ڕیام بە گۆڕی خاقانی مەغفووردا! ئیتر پەنا بەخوا دەسا چی ئەبێ با ببێ».

١٣٠. پیاوێك هەبوو لە سولەیمانی «عەلی فەوتاویان» پێ ئەوت. ئەم عەلی فەوتاوە کە ئەڕۆیشت لە پشتەوە پیاوی وا جوان و شۆخوشەنگ و کەڵەمێرد کەم ئەبینرا؛ بەڵام لە پێشەوە بە پێچەوانەی

ئەوە، لە ناشیرینیدا مەگەر وێنەی خۆی لە ئاوێنا هاوتای بکردایە، ئەگینا کەسی‌تر نەبوو.

وتی: ئەوا ڕۆژێك بە کۆڵانێکا ئەڕۆم، سواڵکەرێك شوێنم کەوتووە بانگم ئەکا: جوان، بیکە بە خاتری ئەو قەد و باڵاتە پوولێکم بدەرێ. منیش ناوێرم لا بکەمەوە، ئەمەوێ خۆم دەرباز کەم، بەڵام ئەو وازم لێ نایەنێ هەر بەشوێنمەوەیە. لە ئاخرا چارم نەما لایەکم بۆ کردەوە. وتی: کە سواڵکەرەکە سەیری کردم و تێ‌گەیشت من چماڵێکم، دەستی برد پوولێکی دەرهێنا و وتی: «ها من پوولێك بدەم بە تۆ هەچ قسەیەکم کردووە بە خەسار چوو و گووم خواردووە».

١٣١. هەر ئەم عەلی فەوتاوە گێڕایەوە وتی: کوڕینە! کەس پشت بە دنیا نەبەستێ. من دنیا پشتی تێ‌کردم و ڕووم کردە سینەماکان بۆ بلیت فرۆشتن. ئەوا لە سینەمایەکدا لە شار بلیت ئەفرۆشم، بەڵام کاتێ کە کچان دێن بۆ سینەما و بلیت وەرئەگرن لەبەر ئەوە کە من خۆم ئەناسم چ ماڵێکم و چ سەر و شکڵێکم هەیە، کاتێ کە بلیتەکەیان ئەدەمێ ڕووی خۆم وەرئەچەرخێنم.

ئێوارەیەك وا چەند کچ و ژنێك هاتن بلیتیان وەرگرت، منیش لەسەر عادەتەکەی خۆم ڕووم کرد بەولاوە. گوێم لێ‌بوو کچەکان لەبەین خۆیانا ئەیانوت: «ئەی عەمری درێژ بێ تەماشا ئەم کوڕە چەن بەحەیا و شەرمە هیچ سەیری کەس ناکا. بە عەدەبێکەوە بلیتەکە ئەدا و بەری خۆی ئەکا بەولاوە. یارەبی بە برامان بێ!».

١٣٢. ڕەشوانی گێڕایەوە وتی: کوێخا قادرێك هەبوو لە دێی «دڕی». ئەمە هەرچەندە نان بدە و بەخزمەت بوو بۆ میوانان، بەڵام

کاتێ کە میوان ڕووی تێ ئەکرد تا هەندێ قسەیان پێ نەوتایە دایانی نەئەکرد. سەرلەئێوارەیەك نۆ فەقێ ڕێیان ئەکەوێتە دڕێ و ئەچن بۆ ماڵی کوێخا قادر. کوێخاش ڕێگایان نادا و نایەڵێ بچنە ژوورەوە. ئەمانیش دەردەکەی ئەزانن قسەی پێ ئەڵێن. پاشان کوێخا ئەڵێ: چەند کەسن؟ ئەڵێن: چوار موستەعد و پێنج سوختە. ئەڵێ: «باشە موستەعدەکان بێنە سەرەوە و سوختەکانیش بکەنە تەوێڵە».

١٣٣. لەو سەرە لە دێی «کەسنەزان» پیاوێك هەبوو «کەوە»ی ناوبوو، چەرچیەتی ئەکرد. خوا هەقە بە پیاوێکی بەدەسەڵاتیش ناو ئەبرا. ژنێکی جوانکەلەی هەبوو ئەیانوت: ئەم ژنە دۆستی هەیە، قسەکە بەر گوێی «کەوە» کەوتبووەوە؛ کەوە ویستی بە تەواوی تێ بگا.

ڕۆژێك بە ژنەکەی وت: ئافرەت، ئەڵێن: گوێزی هندستانیان هێناوەتە شار، ئەو گوێزەش لێرە پارەی چاك ئەکا، توێشووم بۆ ڕێك خە با بچم هەندێکی لێ بێنم؛ ڕەنگبێ چەند ڕۆژێکیش لەبەر ئەو هەر دوا بکەوم. ژنە توێشووی بۆ ڕێك خست و «کەوە» لێی دا ڕۆیشت.

هەر کە ئەو ڕۆیشت ژنە خەبەری نارد بۆ دۆستەکەی کە ئیمشەو بێت بۆ ماڵەوە بە دڵنیایی بۆ خۆیان ڕائەبوێرن. لەولاشەوە «کەوە» کە لێی دا ڕۆیشت نەچوو بۆ شار، خۆی خلافاند تا شەو بەسەرا هات، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە چووە سەربان، لەسەر کلاوڕۆژنەکە سەیری خوارەوەی کرد. تەماشای کرد ئەوا ژنەکەی لەگەڵ زەلامێکا بەرانبەر بە یەك دانیشتوون قسەی خۆش خۆش ئەکەن؛ تومەس ئەوە دۆستەکەیە هاتووە. ژنە لە بەرانبەر دۆستەکەیەوە دانیشتووە و دەستی خستۆتە سەر دوا بڕاوەکەی خۆی و ئەڵێ:

**مەسـلی مەسـان ئەمەسە   سافی بەر هەسـان ئەمەسە**
**پیشـۆکی کەیفان ئەمەسـە   گوڵمەی بەر دەسان ئەمەسە**

دۆستەکەش ڕووی کردووەتە ئەو، ئەویش دەستی خستۆتە سەر حەیتەکەی خۆی ئەڵێ:

**تەڕکی سەر دەستان ئەمەسە   بڕکی ناو بێسـان ئەمەسـە**
**سوورەی هەواسان ئەمەسە   ناوکی ناو باسـان ئەمەسـە**

پیاوەش کە لە سەرەوە گوێی لەم قسانە بوو هاتە زمان و وتی:

**گوێزی هندسـتان ئەمەسە   گورزی سەر گورزان ئەمەسە**
**کەوەی کەسـنەزان ئەمەسە   دەنگی سەر بەرزان ئەمەسە**

ئەمجا بە پەلە هاتەخوارەوە و هەردووکیانی داپاچی!.

١٣٤. شێخ فەتاح هەبوو پیاوێکی عەنتیکە و قسـەقوت بوو. ڕۆژێ ئەوا خەریکە دەمی ئەجوولێ، شتێکی پێیە ئەیەوێ بە دزی منەوە بیخوا. وتم: شێخ فەتاح ئەوە چی ئەخۆی؟ وتی: مێوژ. زۆری پێ‌نەچوو دیسان وتم: شێخ فەتاح ئەوە چی ئەخۆی؟ وتی: مێوژ. بەخوا هەندێکی‌ترێ پێ‌چوو، دیسانەوە پێم وتەوە: شێخ فەتاح ئەوە چی ئەخۆی؟ ئەمجا وتی: «گوو ئەخۆم وازم لێ بێنە». ئیتر منیش وازم هێنا.

١٣٥. کابرایەکی زاخەیی هەبوو ڕۆژگار پاڵی پێوە نابوو؛ لەگەڵ ژنەکەیا ڕێیان ئەکەوێتە ئەو «بازیان»ـە. هەمەوەن تووشیان ئەبن، ڕووتیان ئەکەنەوە. ژنەکە جوانکەلە ئەبێ یەکێ لە ڕێگرەکان پەلی ژنەکەی ئەگرێت و ئەیباتە کەنارێکەوە بۆ ئەوە ئیشی خراپی لەگەڵا بکا. مێردەکەی بەرەنگاری ئەبێ و نایەڵێ. کابرای ڕێگر قۆناغەتفەنگێ ئەماڵێ بە شانی

کابرادا و پەکی ئەخا و سواری ژنەکەی ئەبێ. کابرا لە گۆشەی چاوێکەوە سەیر ئەکا تا کابرا کوتێك ئەدا بە ژنەکەوە، ژنە چوار کوت ئەدا بە کابراوە.

پاش ئیشی خێر کابرای ڕێگر ئەڕوا و بەرەڵایان ئەکا. ئەمجا مێردە بە ژنەکەی ئەڵێ: ئەوا ئیش بوو بە زۆرە ملێ، منم شانم شکاوە و هیچم پێ ناکرێ، تۆیش ئافرەتی و بە زۆر سوارت بوون؛ ئەمانە هەموو قەبووڵە، بەڵام بۆچ تا کابرا کوتێکی ئەدا بە تۆوە تۆ چوار کوتت ئەدا بەوەوە؟ دیارە پێت خۆش بووە، ئەمجا بەبێ ڕەحمانە ژنەکە دائەگرێ!.

١٣٦. حاجی مەحمووی بازرگان هەبوو لە سولەیمانی دووکانەکەی بەرانبەر بە دووکانی فەقێ بوو. حاجی فەقێ بازاڕێکی گەرمی هەبوو؛ ئەو، کەس نەئەچووە لای. ئینجا کە مەردمەکەی ئەبینی ئەچوونە سەر دووکانەکەی حاجی فەقێ بۆ شت کڕین ئەیوت: «تەماشاکە تەماشاکە سەگبابانە ئەڵێی بۆ سەر ئاودەستی مزگەوت ئەچن».

١٣٧. کابرایەکی خەڵکی سولەیمانی بە چەرچیەتی ساڵێك ئەچێ بۆ ئەو وڵاتی موکریانە. بارگیرێکی پێ ئەبێ، لە ڕێگەدا ڕووتی ئەکەنەوە و بارگیرەکەی لێ ئەستێنن. هەڵئەستێ ئەچێ بۆلای «حاجی ئێلخانی دێبوکری» شکات بکا. ئەبیەت کەوا هەموو ڕەئیس عەشیرەتەکانی دێبوکری و «فەیزوڵابەگی» لە ئاوایی «مەرخوس» کۆ بوونەتەوە، ئەڵێ: چاك وایە بچمە ئەوێ و لەوێ لە بەرچاوی ئاغاکانەوە بە حاجی ئێلخانی بڵێم، بەڵکوو لەبەر ئەوان ئەو زوو بۆم بستێنێتەوە.

کە ئەڕوا تەماشا ئەکا وا «حاجی پاشا خانی فەیزوڵابەگی» بە هەموو بەگزادەی فەیزوڵابەگەییەوە و حاجی ئێلخانی بە هەموو بەگزادەی دێبوکرییەوە هەموو لەوێ کۆ بوونەتەوە. ئەچێتە دیوەخان و بە حاجی

ئێلخانی ئەڵێ: ئاغا پیاوێکی هەژار و کاسبم. بارگیرێکم هەبوو لێیان سەندووم، ئێستە هاتوومەتە خزمەتی جەنابت بۆم بستێنێیتەوە.

ئەویش ئەڵێ: کابرا وا دیارە تۆ خەڵکی سولەیمانیت؛ ئەڵێ: بەڵێ قوربان. حاجی ئێلخانیش وەکوو پیاوێکی گەورە بوو، پیاوێکی قسەخۆش و ئەدیبیش بوو، ڕوو ئەکاتە کابرا ئەڵێ: ئەی دەستی ئەو کەسە خۆش بێ کە بارگیرەکەی لێ سەندووی، ئەوە هەقی منە لێی کردوویتەوە. کابرا ناوکی ئەکەوێ ئەڵێ: بۆچی قوربان؟ ئەڵێ: ئەو ساڵە لە شەڕەکەی عەرزدا ئێمە پەرتەوازە بووبووین، ڕێمان کەوتبووە سولەیمانی. ئەوا ڕۆژێك سەیر ئەکەم هەتیوێکی سیسەڵە تانجییەگەڕێکی پەت کردووە بەناو بازاڕا ئەڕوا و دڕن بە خەڵکەکە ئەدا و ئەڵێ: لاچن لاچن بارگەکەی حاجی ئێلخانی هات. لام وایە ئەو هەتیوەش تۆ بوویت. کابرا ئەڵێ: قوربان بەسەری تۆ من نەبووم. ئەڵێ: ئەگەر تۆیش نەبووبیت خۆ خەڵکی سولەیمانی بوو.

ئەڵێ: ئێستە ئەمەی پێ ناوێ من ئێسترێکت ئەدەمێ، بەڵام جنێوێکی سولەیمانییانە بدە بە حاجی پاشاخان ـ ئەوا حاجی پاشاخانیش دانیشتووە ـ حاجی پاشاخانیش ئەڵێ: نەوەڵا کابرا من دوو ئێسترت ئەدەمێ ئەو جنێوە سولەیمانییانە بدە بە حاجی ئێلخانی. ئەوان لە بەینی خۆیانا ئەکەونە قسە، ئەم ئەڵێ جنێو بەو بدە و ئەویش ئەڵێ: نەء؛ جنێو بەو بدە.

کابراش ئەڵێ: جا قوربان! ئەوەی پێ ناوێ، بێعەدەبییە بۆ من قسە بکەم، بەڵام کێری هەردووکتان بە نۆبە بە ناوکم و ئاوی وسڵەکەشتان لەسەر خۆم بە لوولێنەی گۆشتین ئەتاندەمێ. حاجی و ئەوان قاقا دەست ئەکەن بە پێکەنین و هەرسێ ئێسترەکەشی ئەدەنێ.

١٣٨. مەلایەکی پۆشتە و پەرداخ بە کەلیخاندا تێ ئەپەڕێ. کابرایەکی بانەیی ڕێگر تووشی ئەبێ، تەماعی تێ ئەکا کە ڕووتی کاتەوە.

لێی ئەپرسێ: ئەرێ مەلا! سەبری خوا تا چەندە؟ ئەڵێ: تا چل ساڵ. ئەڵێ: کەواتە ڕووتەوە بە تا چل ساڵیتر هەزار کڵاو با ئەیبا. ڕووتی ئەکاتەوە و لێ ئەدا ئەڕوا. زۆر ناڕوا ئەسپەکەی پێی هەڵەنگوێت کابرا ئەکەوێ و قاچی ئەشکێ. بانگ ئەکا ئەڵێ: ئەرێ مەلا خوا بتگرێ تۆ بۆ دەستی منت بڕی، وتت سەبری خوا تا چل ساڵە؟ خۆ هێشتا لێت دوور نەکەوتوومەتەوە ئەوەتا کەوتم و قاچم شکا. مەلاش وتی: ئەوە هی چل ساڵ لەمەو پێشترە؛ هێشتا هێنەکەی من ماوە.

١٣٩. پیاوێك لەو دەشتی هەولێرە هەبوو «عەزیزۆك»ـی ناو بوو، ژنێکی هەبوو «ئایشۆکێ»ـی ناوبوو. ڕۆژێ میوانیان دێت، عەزیزۆك بە ئایشۆکێ ئەڵێ: ئەوا میوانمان هاتووە بچۆ مریشکێکیان بۆ بکوژەوە. ئایشۆکێش ئەچێتە ژوورەکەیتر دەرپێکەی دائەکەنێ و هەر دەرناچێ. عەزیزۆکیش سەیر ئەکا ئایشۆکێ هیچ دیار نییە و میوانیش دانیشتووە. ئەچێتە ژوورەکە بۆ لای ئایشۆکێ، کە چاوی پێ ئەکەوێ ئەڵێ: پیاوەکە تۆ وەخت و ناوەخت نازانی، ئێستا کەی وەختی ئەوەیە؟ عەزیزۆکیش ئەڵێ: خوا بتگرێ من وتم: بچۆ مریشك بکوژەوە یا دەرپێ داکەنە؟.

١٤٠. کابرایەکی کوردی شاری، ساڵێك ئەچێتە «زوبەیر». کوڕێکی جوانی بەرچاو ئەکەوێ، بەڵام کوڕەکە چاوێکی کوێر ئەبێ. تەماع ئەکاتە کوڕەکە و نازانێ چۆن هەڵیبخڵەتێنێ. ڕۆژێك لە حەماما کوڕەکەی بەرچاو ئەکەوێ. ئەمیش چاوێکی خۆی ئەنووقێنێ و ئەچێ بەلای کوڕەکەوە ئەڵێ: بیستوومە هەرکە یەك چاوی نەبێ و خەڵکی بکێشێ بەسەر خۆیا چاوەکەی چاك ئەبێتەوە. ئێستەش وەرە تۆ لەبەر

خاتری خوا سوارم بە با ئەو چاوەم چاك بێتەوە.

کوڕە لەگەڵیا ئەچێتە سووچێکەوە و سواری کابرا ئەبێ نزیك ئەبێ تێی بخا و تێی نەخا کابرا چاوەکەی بەرز ئەکاتەوە و ئەڵێ: ئای چاك بووەوە.

کوڕە سەیر ئەکا ڕاستە، هەردوو چاوی ساغە. زۆری پێ خۆش ئەبێ ئەڵێ: کەواتە تۆیش وەرە سواری من بە با چاوەکەی منیش چاك بێتەوە. کابرا بە ئارەزووی خۆی ئەگا و سواری ئەبێ و هیچ درێغی لێ ناکا. کوڕە دەستی کرد بە هاوار هاوار وتی: سەگباب! دەریبێنە نزیکە وا چاوەکەی تریشم کوێر بێ!.

١٤١. شێخ بابەعەلی تەکیەیی ڕۆژێك لە حوجرەی فەقێکانا دائەنیشێ و دەرگاکە لەسەر خۆی پێوە ئەدا. فەقێیەکی سوختە لەو وەختەدا لە دەرەوە دێت و بە پەنجە تەقە ئەدا لە قاپیەکە. ئیتر نازانێ بابەعەلی لە ژوورەوەیە. بابەعەلی ئەڵێ: ئەوە کێیە؟ فەقیەکە ئەڵێ: «أنَا»، بابەعەلی. ئەڵێ: ئەی لە قنگی ئەنە بەرم، ئەنە چییە و کێیە؟ فەقێ لە گۆشەی قاپییەکەوە سەیر ئەکا ئەمە بابەعەلییە، تف و ئیتر بۆی دەرئەچێ و ئاوڕ ناداتەوە. لە پاشا لە بابەعەلی ئەپرسن: ئاخر ئەمە بۆ خۆت خراپ بوو ئەڵێ: وا نییە «أنَا»م کرد بەناو بۆ ئەو.

١٤٢. جارێك لە سولەیمانی گوایە عیززەتی تۆپچی کفری کردووە، مەلاکان لێی ئەکەونە تەقە و هەچ مەلا و فەقێیەك لە سولەیمانی ئەبێ لە مزگەوتی عرفان کۆ ئەبنەوە و ئیشەکە زل ئەکەن و فتوای کوشتنی عیززەت ئەدەن. عیززەت شەو لە تاوێك بەدزییەوە سولەیمانی بەجێ دێڵێ و هەڕا ئەکا بۆ بەغدا بۆلای شێخ مەحموودی

حەفید کە ئەو سەردەمە لە بەغدا بوو. شێخ مەحموود بۆی تێ ئەکەوێ و ئیشەکەی لەلای حوکوومەت بۆ چاك ئەکاتەوە.

جا لەو کۆبونەوەدا مەلاکان سوختەیەك ئەنێرن بۆلای شێخ بابەعەلی کە عەرزی بکا ئەوا ئەوان لەوێ «ئیجتماعیان» هەیە ئەویش تەشریفی بێت.

سوختە ئەچێ ئەڵێ: قوربان مەلاکان وا لە مزگەوتی عرفان «جماع» ئەکەن، عەرزیان ئەکردی ئەویش تەشریف بێنیت. شێخ بابەعەلی هەڵئەستێ جوببەکەی ئەدا بە شانیا و ئەڕوا. کە ئەگاتە ناو حەوشی مزگەوتەکە هەر چاکی ئەکا بە لادا و دەست ئەگرێ بە بەنەوخوێنەکەیەوە. ئەوا حەوشە و سەکۆ و بەرهەیوانی مزگەوت پڕە لە مەلا و فەقێ و حەشامات. عالەمەکە بەلایانەوە سەیر ئەبێ کە بابەعەلی وا ئەکا ئەڵێن: قوربان ئەوە چییە؟ ئەڵێ: چی چییە، سوختەکە هاتووە ئەڵێ: جیماع ئەکەن ئەبێ منیش خۆم حازرکەم.

١٤٣. فەقێیەکی مووسڵی هاتبووە سولەیمانی لە خانەقای حاجی شێخ ئەمین دامەزرابوو. ئەچێتە لای شێخ بابەعەلی تەکیەیی بۆ دەرز خوێندن. ئەم فەقێیە کوردی هیچ نەئەزانی، بە شێخ بابەعەلی ئەڵێ بە عەرەبی: قوربان من هیچ کوردی نازانم کە قسەم لەگەڵ ئەکەن زۆر پێم شەرمە نازانم جوابیان بدەمەوە. چەند شتێکم فێرکە هەر ئەوەندە بتوانم چاك و چۆنییان لەگەڵ بکەم، بەتایبەتی مەلاکان؛ هەر زۆر پێم شەرمە نازانم قسەیان لەگەڵ بکەم.

ئەویش ئەڵێ: باشە کوڕم، سبەینێ جومعەیە و خەڵك هەموو ئەچن بۆ مزگەوتی گەورە بۆ نوێژی جومعە تۆ بچۆ لە بەر دەرگاکە هەرکەس کە

هات و خۆت ئارەزووت کرد قسەی لەگەڵ بکەی پێی بڵێ: «مەرحەبا زەنگوڵە بە گون» ئیتر ئەمە شوێنی هەموو شت ئەگرێتەوە. فەقێ بە پوختی ئەمە ڕەوان ئەکا و سبەینێ ئەچێتە بەر قاپی مزگەوتی گەورە.

پێش هەموو مەلایەك، سەی عەزیزی خەتیب دێت پێی ئەڵێ: مەرحەبا زەنگوڵە بە گون. ئەو ئەمەی بەلاوە زۆر سەیر ئەبێ. بەشوێن ئەودا مەلا حسەینی پیسکەندی دێت بەویش هەروا ئەڵێت. پاشان مەلا عەزیزی موفتی. بەو جۆرە پیا ئەڕوا هەرکەس دێت پێی ئەڵێت: مەرحەبا زەنگوڵە بە گون، ئەمانە هەموو سەرسام ئەمێنن لەم قسەیە و لە بەینی یەکا ئەکەونە قسە کردن. مەلا عەزیز ئەڵێ: ببێ و نەبێ ئەمە ئیشی بابەعەلییە.

لە ئاخرا فەقێ تێئەگەیەنن کە ئەمە چاك و چۆنی نییە و ئەمە شتێکی سەیرە. فەقێم فەقێ ئەبێ، هەر دێتەوە و شتومەکەکانی ئەپێچێتەوە و سولەیمانی بەجێ دێڵێ. ئەڵێ: ئەمە مەلا چاکەکەیان بێ، ئەی خەڵکەکەیتر چۆن بن؟ تا نەیانگاوم با بۆی دەرچم!.

١٤٤. شێخ بابەعەلی تەکیەیی لە بەرهەیوانی حوجرەکەی خۆیا لە مزگەوت کردبووی بە عادەت دائەنیشت. سوختەیەکی مناڵی موکریانی هاتبوو لەوێ دامەزرابوو، ئەم سوختەیە ئەبوایە خێرا خێرا لە حوجرەکەی خۆیانەوە بچوایە بۆ سەر حەوزەکە بۆ ئیستکان و قاپ و قاچاخ شتن. وە ئەبوایە بە بەردەمی بابەعەلیشدا تێپەڕ بووایە. لە هەر چوون و هاتنەوەیەکیدا سەلامێکی ئەکرد و بابەعەلیش ئەبوایە جوابی بدایەتەوە.

لە ئەنجاما وەڕز بوو لەم هەموو سەلامە، ڕووی کردە فەقێکە و

چاوێکی لێ زیت کردەوە وتی: ئەرێ باوکم! هیچ وا بزانی من سەلامولغی تۆم لێرە دانیشتووم؟ بۆچ وازم لێ نایەنی؟ بەو ئیمام هەمزەیە جارێکی‌کە سەلام بکەی سەلامت تێ بەرئەدەم.

١٤٥. لە سەردەمی عوسمانییەکانا ئیمتیحانی «تەدریس» بۆ مەلایەتی لە مووسڵ ئەکرا. شێخ بابەعەلی بۆ ئەم ئیمتیحانی تەدریسە لە سولەیمانییەوە ئەچێ بۆ مووسڵ. شێخ بابەڕەسووڵی عەبابەیلەیی ـ کە فەقێی خۆی ئەبێ ـ لەگەڵ خۆیا ئەیبا. لەوێ کە ئەچنە ژووری ئیمتیحانەوە چەند کەسێك لە مەلا گەورەکانی مووسڵ لەوێدا دانیشتوون و ئیمتیحانی ئەکەن. یەکێ لەو پرسیارانە کە لێی ئەکەن و زۆر ئاسانیش ئەبێ بابەعەلی ئەوەیان نازانێ. بە پەلە و بە کوردی لە شێخ بابەڕەسووڵی فەقێی خۆی ئەپرسێ، ئەویش خێرا هەر بە کوردی پێی ئەڵێتەوە، ئەمجا بابەعەلی هەڵئەستی و ئەڵێ: **«یَقولُ إمامُ الآفاقِ بِالإتّفاقِ أستاذ الكُلّ في كلّ عَلَى الإطلاق غِطريف المُتَأخّرين وَ أكمَلُ المُتَبَحّرين نَبذَة جَهابِذَةِ الكابُليّ الشّيخ رَسول العَبابَيلي في كِتابِهِ هكذا حلّ مَسئلَة الشّهير»**.

که مەلاکان گوێیان لەم عبارەتە ئەبێت و قەتیش نە شێخ بابەڕەسووڵی عەبابیلێ و نە کتێبی ئەویان بیستووە، هەموو ئەکەونە سەر ئەوە کە ئەوان هیچ نازانن بۆیە تا ئێستە عالمێکی وایان گوێ لێ نەبووە.

بۆ خۆی بەم جۆرە چاو بەستنە لەم ئیمتیحانە سەر ئەکەوێ و ئەگەڕێنەوە. لە ڕاستیشدا وەڵامەکەی ڕاست بووە.

١٤٦. هەژار گێڕایەوە وتی: کتێبێکی «سَعدینی»ـم هەیە، ئەم کتێبە حاشیەیەکی زۆری بەسەرەوەیە. وا ڕێك کەوتووە لەناو یەکێ لەو حاشیانەدا «ضَرط»ـی تێدایە. یەکێکی‌تر هاتووە مەعنای لێك

داوەتەوە لە ژێریا نووسیویەتی: «أی: ترِ لِکاتِبِهِ».

١٤٧. ڕۆژێـك لـە سولەیمانی کـوڕە جوولەکەیەکـی بازرگان لەگـەڵ سواڵکەرێکی ناو بازاڕا شەڕیان بوو. دنیا زستان و سەرما بوو، کـوڕە جوولەکەکـە لـە دووکانەکەی باوکیا دەستێ جلـی پاك و پاڵتاوێکی نایابی لەبەرا بوو، لەبەر مەنقەڵی ئاگر دانیشتبوو. هەتیوەکەش سەر و پێ ڕووت، کراسێکی جاوی چڵکن کە قۆڵەکەی هەر لە ئانیشکی بەرەوژوور مابوو، یەخەی هەتا خوار دڕابوو هەموو گەڵوگونی بەدەرەوە بوو، لە سەرمانا وەکـوو بـی ناو ئاو دەلەرزی، بەر دووکانەکەی گرتبوو هەر ئەیوت: کافر، شەرت بێ لە دووکانەکە بێیتە خوارەوە هەزار شەقت تێ‌هەڵدەم.

جوولەکەی باوکی کوڕە بە هێواشی لە دووکانەکە هاتە خوارەوە دەستی برد دوو پوولی دایە و قۆڵی گرت و وتی: بڕۆ، بڕۆ بە چیتەوە ماڵ ویـران، بە چیتەوە؟.

١٤٨. کابرایەکی مەرزیـك سـواری ئەسـپێك ئەبێت و تفەنگێکی لە بەردەم خۆیا دانابوو بە دەشتێکا ئەڕوات. جەردە تووشی ئەبن و ڕووتی ئەکەنەوە، لە پاشـا لێیان پرسـی: بۆچ هێشـتت ڕووتت بکەنەوە خۆ تۆ چەکت پێ‌بوو؟ وتی: ئەرێ برا دەستێکم بە تفەنگەکەوە بوو دەستێکم بە دەستەجڵەوەکەوە. ئیتر بۆچ مامرم بە دەنووك شەڕ بکەم؟.

١٤٩. لە دێی «تەپەکوڕە» بێوەژنێکی جوان هەبوو کوڕێکی لە حوجرەدا بوو ئەیخوێند. مامۆستای مناڵەکە ویـستی دایکی کوڕەکە مارە کا، بەڵام بێوەژنە مێردی پێ نەئەکرد.

ڕۆژێك مامۆستاکە تێروپڕی دا لە مندالەکە و پێی وت: ئەوە تۆ بۆچی

لای دایکت وتووتە دەعباکەی مامۆستا زلە؟! مناڵەکە بە گریان گریان ئەچێتەوە و شکات ئەخاتە بەر دایکی. «بەرەکەت دا» ئەم شکاتە بوو بەهۆی ئەوە کە دایکی مێرد بە مامۆستا بکا.

.١٥٠ لە کرماشانا ژنێکی خراپکار لە گەڕەکێك دانیشتبوو. لە دراوسێیا هەتیوێکیش هەبوو، بازاڕی ژنەی کز کردبوو. ڕۆژێك ژنەکە ئەچێ پێی ئەڵێ: «ئەی قەرە ئەو کارە مەکە، لەو دنیا ڕای جواو وە زەحمەت کەفی». کوڕەش ئەڵێ: «خانم تۆ خەمت ڕای خۆتبوو، تۆ توای جواو دوو سوراخ دەی، من هەر یەی سووراخە».

.١٥١ کابرایەکی قومارباز سواری هەتیوێك بووبوو، سەیری کرد هەتیوەکە خەنجەرێکی بە لاقەدەوەیە. لە وەختی ئیشا لە هەتیوەکە ئەپرسێ: ئەم خەنجەرەت بۆچ هەڵگرتووە؟ هەتیوە ئەڵێ: «بۆ ئەوەیە ئەگەر یەکێك بە چاوێکی خراپەوە سەیرم بکا بەم خەنجەرە ورگی بدڕم». کابرا ئەڵێ: «سەد هەزار شوکر کە من بە چاوی خراپەوە سەیری تۆ ناکەم!».

.١٥٢ ئەحەی کرنوو کە لە یەکێك تووڕە ئەبوو پێی ئەوت: «بڕۆ هەی پیرێژنی بە قوز تڕیو».

.١٥٣ دوو برا هەبوون یەکێکیان «چاوخاس» و ئەوی‌کەیان «ناوخاس»ی ناوبوو. ڕۆژێك چاوخاس ئەچێ بۆ لای شێخی بیارە. شێخ لێی ئەپرسێ: چاوە، ناوخاسەی برات چۆنە؟ ئەمانەش خەڵکی بەری زەهاو ئەبن، ئەڵێ: بیم وە ساقەت ناوخاس بیە وە دەر». (دەر: بەرازە).

١٥٤. عەزە وەیلیسە هەبوو دنیا زستان بوو لە کۆڕێکا لە گوێ ئاگردانێك دانیشتبوو فووی لە ئاگرەکە ئەکرد. لەو کاتەدا کتوپڕ بایەکی لێ بووەوە. هەر هەستا و قنگی کردە ئاگرەکە و وتی: ئەگەر تۆ چاکتری لێ ئەزانی ئاگرەکە هەڵکە؛ ئەگینا ئەم هەڵەوەڕی و قەرەچناغییەت لە چییە؟».

١٥٥. وەستای برای مارف لە سولەیمانی بەرگدروو بوو. بەڵام لەبەر بێ تووتنی و بێ کاسبی لەو ڕۆژەدا ئوتووچێتیشی بەدەمەوە ئەکرد. ڕۆژێك لەگەڵ حەسەنی سەی ئەحمەدی خوشکەزایا لە دووکانەکەی خۆیا دائەنیشن و قسە ئەکەن. وەستا تازە ژنێکی تری هێنابوو، حەسەن لێی ئەپرسێت: توخوا خاڵە ئەم ژنەت چۆنە؟ ئەویش ئەڵێ: وەڵڵا ڕۆڵە خراپ نییە. ئەڵێ: خاڵە ئەم باشترە یا ژنەکەی پێشووت؟ ئەڵێ: بۆچی ئەپرسی؟ ئەڵێ: هەروا. ئەڵێ: وەڵڵا ڕۆڵە ئەوی ڕاستی بێ ژنەکەی پێشووم تۆزێ قوزی گەرمتر بوو، ئەم ساردە سارد. ئەڵێ: جا خاڵە ئەمە چاری ئاسانە. ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: «لەو کاتەدا ئەچیتە لای تۆزێ چیلکە داگیرسێنە و بیخەرە پاشەڵیەوە ئیتر پێشەڵی گەرم ئەبێ». ئەویش ئەڵێ: ئەی ئەی تف لە چارەت بۆ قسەت.

١٥٦. حاجی برایمئاغای عەنبار ڕۆژێك سەر بانی کۆشکەکەیان سواغ درابوو هێشتا وشك نەبووبووەوە لەگەڵ کوڕەکەیا بە پێپلیکانەکانا سەرئەکەون و ئەچنە سەر بان. لەسەر بانەکە ئەچنە ئەوسەر و ئەگەڕێنەوە. لەبەر ئەوە کە قونگرەیان لە پێدا بوو شوێنەکەی بەسەر بانەکەدا چاڵ کەوتبوو. حاجی کە بەرچاوی ئەکەوێ، لەوێ بانگ ئەکا لە خزمەتکارەکەی ئەڵێ: «دەویت باوك بۆچ هێشتووتە ئەم کەر و جاشە سەرکەونە سەر

ئەم بانە؟».

خزمەتکارەکەش ئەڵێ: قوربان کەر و جاشی چی؟ کەر و جاش چۆن بەم پێ‌پلیکانانەدا سەرئەکەون؟ ئەویش ئەڵێ: «قوون فرە باب! بۆچ خۆت لە من بە عاقڵتر ئەزانی وا ئەتەوێ بمخەیتە درۆوە؟ ئەوە نییە شوێن‌پێکانیان دیارە».

خزمەتکاری قوڕبەسەریش ناوێرێ هیچ بڵێ. ئەگەر ئەڵێ شوێن پێی خۆتانە تێروپڕ تێ‌هەڵدان ئەخوا؛ چار ناچار بێدەنگ ئەبێ.

ئاغا لە گەڕانەوەیانا بەسەر بانەکەدا دیسان دوو شوێن پێی‌تر ئەبینێ. ڕووی تێ ئەکاتەوە و ئەڵێ: «سەگباب ئەوەتە تا ئێمە لێرە بووین کەر و جاشێکی‌تر سەرکەوتنەوە؛ کەچی چاویشمان پێیان نەکەوت». ڕوو ئەکاتە کوڕەکەی و ئەڵێ: «ڕۆڵە با بچینە خوارەوە ئەمە جنۆکان خۆیان کردووە بە کەر و جاش و کەوتوونەتە ئەم سەربانە ئەیانەوێ دەستمان تێ‌ژەنن. نەوەڵڵا تا شێتیان نەکردووین با بچینەوە خوارەوە».

**١٥٧.** جارێك یەکێ لە حاکمانی پێشوو لەسەر تەلار دووربینی بەدەستەوە بوو تەماشای کرد و تێ‌فکری ئەوا کابرایەکی ڕووتەڵەی کورد چووە شیوێکەوە تۆزێ مایەوە و هەڵسا. حاکم مەراقی کرد، هات بزانێ ئەم کابرایە لەو شیوە چی کردووە؟ کە چوو تەماشای کرد، کابرا گوویەکی کردووە بە قەد یەك مەنی تەورێز. کابرای هێنا وتی: تۆ خواردنت چییە؟ وتی: نانی جۆ. حاکم وتی: خۆ من فرنی و شەکەرلەمە ئەخۆم، کەچی ئەچمە سەر ئاو دووسەعات دائەنیشم ئەوسا بە قەد ڕیقنە مریشکێکم لێ ئەبێتەوە. کابرای هەژار وتی: قوربان تۆ بە کاڵی دائەنێی نایەڵی بگات!». حاکم پرسی: چلۆن ئەگات. وتی: مەچۆرە سەر ئاو هەتا

زۆرت بۆ دێت، ئینجا ئەو وەختە بە ڕەحەتی وەکوو من گوو ئەکەی.

حاکم بە قسەی کرد، لە دیواندا بوو هەر ئیشی سەر ئاوی بوو نەچوو، ئاخری لەناو خەڵکەکەدا خۆی پیس کرد. لەبەر شەرمەزاری فەرمانی دا هەژارەکەیان هێنا وتی: «سەگباب تۆ بۆچی ئەمەت بە من کرد؟» کابرای ڕووتەڵە زۆر ترسا وتی: «قوربان جارێ ئەبێ تەماشای بکەم». دەرپێکەی حاکمی وەرگرت ئەنگوستێکی لە پیساییەکەی دا و خستیە سەر زمانی. ئینجا وتی: پاشام عەرزم کردی: بیگەیێنە، نەموت: بیترێنە. ئەمە تراوە بۆیە وات بەسەر هاتووە. کابرا بەم جۆرە خۆی لە چنگی حاکم ڕزگار کرد.

١٥٨. کابرایەکی «لەیلاخی» هەبوو، هەرکە میوانیان ئەهات و نانیان بۆ دائەنا خۆی دوو سێ پارووی ئەخوارد لەگەڵیا و لە پاشا دەستی هەڵئەگرت و ئەیوت: «برا ئیتر من بەس». میوانەکەش ناچار دەستی هەڵئەگرت. ڕۆژێ کابرایەکی ئەحمەدئاوایی ئەبێ بە میوانی، نان دائەنێن و کابرا لەسەر ڕەوشتی جارانی دوو سێ پاروو ئەخوا و ئەڵێ: برا من ئیتر بەس. کابرای میوان گوێی نەدایە وتی: «بەخوا برا من ئەخۆم هەتا هەس!».

١٥٩. کوڕێکی «گۆمەیی» چووبوو بۆ خوێندن. چەند ساڵێکی پێ چووبوو گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان هیچیشی نەخوێندبوو. لێیان پرسی: بۆچی نەتخوێندووە؟ وتی: «ڕۆژێ خۆم تاقەتم نەبوو، ڕۆژێ مامۆستام. ڕۆژێ هەردووکمان، ڕۆژێ جومعە بوو، ڕۆژی سێشەنبە، ئیتر لە کوێ بخوێنم؟!».

١٦٠. فەقێیەکی «باجەلان»ـی لە پاش ئەوە کە ئەچێتە فەقێتی، فێری نووسین ئەبێ؛ بە شانازییەوە ئەم کاغەزەی خوارەوە بۆ

ماڵی خۆیان ئەنووسێ: «خواهەر عەزیـزم، ئاغای باوکـم، سـەلامەت میرەسانم. هەروەها بەرادەر عەزیزەم، خاتوو دایکم، سەلامەت میرەسانم. کراس شڕ، دەروڵەشڕ، خۆم شڕەندەر شڕ، ئەگەر مەواچۆن چێش مەوانی «پرووض الوضوئیە». کارەکەرتان: کوڕی خۆتان!».

.١٦١ ژنێکی «هەرکـی» جارێك لەگەڵ کۆچ و باردا ئەڕوا بۆ زۆزان. مانگایەکی لە پێشەوەیە باری لێناوە، ئەگاتە لاپاڵێکی خلیسك مانگا هەڵئەخلیسکێ. ژنە کلکی ئەگرێ و ڕایئەکێشێ و بانگ ئەکا: «یاسـەیدتاهە، یاسـەیدتاهە». مانگا هەر گل ناخواتەوە و ئەڕوا ئەکەوێ. ئینجا ژنە تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: «دە هەڕە کیری سەید تاهە بن کورێ تە بی». کور: کلك.

.١٦٢ جارێـك دوو کوڕی سـوورچی ـ کە بـرا بوون ـ ماڵەکەیان بەش ئەکرد. ڕەوشتی ئەو کۆچەرایەتییە وابوو کە باوك پیر ئەبوو، ئیتر چاوەڕێی مردنیان نەئەکرد، میراتگرەکان ماڵەکەیان بەش ئەکرد.

ئینجا هەمووی بەش ئەکەن ئەمێنیتەوە سەر سەگێك و باوکەکەیان. کوڕێکیان ئەڵێ: «سە بۆ من، باب بۆ تۆ». ئەوی‌تریان ئەڵێ: «نە، سە بۆ من، باب بۆ تۆ». لێیان ئەبێتە دەمەقاڵ ئاخری بەو جۆرە ڕێ ئەکەون: کە جاشێك بخەنەسەر بابەکە ئەو وەختە یەکێکیان سەگەکە هەڵبگرێ و ئەوی‌کەشیان جاشەکە و باوکی هەڵبگرێ.

.١٦٣ ژنێك هەبوو لەو سەرە کچێکی زۆر جوانی هەبوو. هەرچەندە خوازبێنی‌کەر ئەهات کچە شەڕی لەگەڵ ئەکرد و ئەیوت: من شوو ناکەم. شوو بکەم دارێکی زلم تێبڕن و عەزیـەتێکی زۆرم بدەن؟

من شتی وا ناکەم. ئاخری پیاوێکی دەوڵەمەند ناردیە داوای، دایکی کچە زۆری پێ خۆش بوو کە بیدا بەو پیاوە. چووە بن دەست کچەکەیەوە و پێی وت. کچەش هەر لەسەر قسەی خۆی بوو. ئەمجا پێی وت: کچم تۆ ئەوەت ئەوێ کە کێری زلت تێ نەبڕن، من خۆم لەگەڵت دێم هی مێردەکەت بە دەستی خۆم ئەگرم بە ئارەزووی خۆت چەندت ویست ئەوەندەی ئەکەمە ژوورەوە. کچەکە بەم جۆرە ڕازی بوو مارەیان کرد.

ئینجا شەوێ کە بووکیان برد، دایکی لەسەر پەیمانەکە لەگەڵی چوو. زاوا کە هات دایکی کچە دەعباکەی گرت و پڕ بە مست و نەختێکی بۆ بەردا. کچەکە وتی: دایە با نەختێکی تریش بڕوا. ئەویش دەستی شل کرد، تۆزێکی تریش ڕۆیشت. کچە وتی: دایە با بێ، ئەمجارە دایکە بە جارێ دەستی بەردا و هەمووی ڕۆیشت. کچە وتی: دایە با هەندێکی تریش. دایکی وتی: ڕۆڵە ئیتر هیچ نەما هەمووی ڕۆیشت. کچە وتی: «دایە چیت پێ بڵێم؟ باوکم بەڕەحمەت بێ، هەموو جار ئەیوت: یاخوا دایکت دەستی نەگاتە هیچ، هەرشتێ دەستی گەیشتێ پیت و بەرەکەتی ناهێڵێ، ئەوا ڕاست بوو پیت و بەرەکەتی ئەمەشت برد و هیچت نەهێشت!».

١٦٤. لە دێی «یاخیان» کابرایەك ناوی حەمەعەلی عەجەم بوو، لە «سەفەربەر»دا بە ڕەشبگیر گرتبوویان. لە سولەیمانی لە «عەمەلە بلووکی»دا دامەزرا بوو. لەو بەینەدا دە پانزە سواری زەفتیە چووبوونە یاخیان لە سەرچاوەکە دابەزیبون. ژنێکیش هاتبوو «کوند»ەی پڕ ئەکرد، چاوشێکی زرتەبۆز لە نزیك ژنەکەوە دەستی بە ئاو ئەگەیاند، دەستی بە دەعباکەیەوە بوو ئەیوت بەژنەکە: «تماش تماش». ژنەکەش ئەیوت: «ڕاوەستە باوەحیز شەرت بێ بیژم بە حەمەعەلی عەجەم».

١٦٥. پیاوێك هەبوو لە سولەیمانی کارەکەرێکی لە ماڵا بوو، ڕۆژێك ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە هەتیوێکی بەسەرەوە چاو پێ ئەکەوێ. پێی ئەڵێ: چەتیو ئەمە بۆچ وات کرد؟ ئەویش ئەڵێ: «وەڵڵا ئاغە سوێندی دام بە سەری تۆ، تۆیش ئەزانی کە سەری تۆ چەندە بەلامەوە عەزیزە؟ وتم: باشە». کابرا ئیتر هیچ دەنگی نەکرد.

١٦٦. لە سەردەمی خۆیا کاروان بە قافڵە بوو. جوولەکەیەکی بازرگان هەبوو موسوڵمان بووبوو، ئەمجا حەجێکیشی کردبوو، بووبوو بە پیاوێکی تەواو. ڕۆژێك بارخانە بار ئەکا و ئەچێ بۆ تەورێز. لەو دەشتی «مەرگەوڕ»ەدا تووشی کوڕە کەچەڵێك ئەبێ کەڵەشێرێکی ئاڵتوونی پێ ئەبێ. دڵی لە کەڵەشێرەکە ئەچێ و ئەڵێ: ئەمە بۆ سەر بارخانەکەم شتێکی زۆر باشە و بەمەوە ئەوەندەیتر ناوم دەرئەکەم. لێی ئەپرسێ: نایفرۆشی؟ کوڕە کەچەڵ ئەڵێ: بەڵێ. ئەڵێ: بە چەند؟ ئەڵێ: ئەیدەم بە گانێك. حاجی جووە ئەڵێ: کوڕەکەچەڵ پیاوی چاك بە ئەمە قسەیە تۆ ئەیکەی؟ کەچەڵە ئەڵێ: هەر ئەوەیە. حاجی جووە نەیتوانی کەڵەشێر لە دڵی خۆی دەرکا، وتی: ئێستە لەم دەشتەدا کێ پێ ئەزانێ دانەیەکی ئەدەمێ و کەڵەشێرەکەی لە دەست دەردێنم. ئەڵێ: باشە، بڵێم چی کوڕەکەچەڵ وەرە با بچینە ئەو قەراخ ڕێگەیەوە. کوڕەکەچەڵ چوو و پێوە نیشت، بەڵام هەر لێ نەبووەوە. جووە وتی: کوڕەکەچەڵ خێراکە چیت کرد؟ خەڵکوخوامان بەسەرا دێت حەیامان ئەچێ. کوڕەکەچەڵ وتی: «جەنابی حاجی جووە خەیاڵە کردووتە! من ئیمرۆ تێم خستووە سبەینێ ئەخووسێ دوو سبەی ئاوم دێتەوە، سێ‌سبەی دەریدێنم». جووە وتی: کوڕەکەچەڵە وازم لێ بێنە گانی خۆتت کرد و بڕۆ کەڵەشێری تۆم ناوێ.

١٦٧. ئەحەی ناسر هەبوو لە سولەیمانی گۆینەدە بوو، ڕۆژێک ئاهەنگێک ئەبێ و دێن بەشوێنیا بۆ ئاهەنگەکە، بۆ گوتن. ئەویش لەو وەختەدا دەنگی نووسابوو، سەر بەرز ئەکاتەوە و دەست ئەکا بە پاڕانەوە لە خوا کە دەنگی بەرەڵا کا. کتوپڕ لەو کاتەدا تڕێک ئەکەنێ. ئەڵێ: «جا وەرە توخوا ئەمە کەتنە؛ من ئەڵێم ئەووم بەرەڵا کە، یا دەنگم بەرەڵا کە؟».

١٦٨. هەر ئەم ئەحەی ناسرە لە کەرکووک لە دیواخانی سەیدئەحمەدی خانەقادا ئەبێ، تڕێکی لێ بەر ئەبێ. سەید سەر بەرز ئەکاتەوە ئەڵێ: ئەحە ئەوە بۆچ وا؟ ئەویش ئەڵێ: «سەید! لۆمەم مەکە تس دەستی بڕیم». بەمە خۆی ئەپەڕێنێتەوە.

١٦٩. محەمەدعەلی کوردی بۆی گێڕامەوە وتی: کابرایەکی «باوەجانی» هەبوو «باوەقولی» ناو بوو، ئەیوت: ئەوانەی شیعر دائەنێن هیچیان شاعیر نین و نازانن شیعر دابنێن، پێیان وت: ئەی تۆ؟ ئەیوت: من سەرباشقەی شاعیرانم، ئەگەر بڕواش ناکەن ئەم ڕازونیازەی بەینی ئەم و ئەو شایەتمانە:

**مەرحەبا کوزەکەی شەل و شێت و دێوانە**

**کێــر ئەوەتە ســێ ڕۆژە لــەلات میوانە**

ئەویتریش وەڵام ئەداتەوە ئەڵێ:

**هەربەخێرهاتی بەسەرچاوم     لنگ هەڵبڕە و هەڵکوتە ناوم**

١٧٠. مەلا ئەحمەدێکی حافز هەبوو لە چوارتا گێڕایەوە وتی: چووبووم بۆ ئەو ئاڵانە بۆ شتێک بێنمەوە بۆ مناڵەکانم بیخۆن. لەوێ لە ماڵێک دانیشتبووم، کابرای خاوەنماڵ بە ژنەکەی خۆی وت: ئا کچێ

هەستە شتێك بدە بەو حافزە. كابرا ـ بلامانێ ـ كێری نەمابوو پشی خواردبووی. ژنەكە بەگوێی نەئەكرد، لەبەر ئەمە زۆر تووڕە بوو، چونكە هەرچەندە ئەم قسەی ئەكرد ژنە وەكوو گوێزی بۆ بژمێرن وابوو. ناچار كابرا خۆی هەستا بێچووێكی هەڵگرت و خستیە دەستمەوە و دەستی پێ نووقانم و وتی: «دە بچۆ وەكوو چلكی سەی، پێت حەرام بێ».

١٧١. كابرایەك «جووتبەننە» لەو بەركێوە سەپانێكی هەبوو، هەموو بەیانییەك ئەم سەپانە كە لە خەو هەڵئەستا دەستی ئەكرد بە خۆ كێشانەوە و خۆ بادان بەملاوبەولادا.

ڕۆژێك ژنی كابرا بە مێردەكەی ئەڵێ: ئەرێ پیاوەكە! ئەوە ئەو سەپانەمان بۆچ هەموو بەیانییەك كە هەڵئەستێ لە خەو دەست ئەكا بە خۆ كێشانەوە؟ كابراش هات بە دەمیا وتی: «چووزانم دەردە كێریەتی». ژنە ئەم قسەیەی لە دڵی خۆیا هەڵگرت. پیاوەش كە قسەكەی كرد زانی قسەیەكی باشی نەكرد و ئاوێكی باشی نەڕشت.

لە پاش چەند ڕۆژێك وتی: ئافرەت ئەمەوێ بچم بۆ شار شتومەكمان نەماوە هەندێ شرۆشاتاڵ دێنم، یەك دوو ڕۆژم پێ ئەچێ ئاگاداری ماڵ و ماڵات و جووتەكە بە. ژنەش كە ئەمەی لە مێردەكەی بیست وەكوو مژدەی بەهەشتیان بۆ هێنابێ وابوو؛ وتی: باشە پیاوەكە ڕاست ئەكەی هیچمان نییە، بەتەما بووم پێت بڵێم، باش بوو تۆ خۆت ئاگاداریت و وتت. پیاوە هەستا چوو لە ماڵەوە «ڕۆن گەرچەك»ـیان هەبوو پڕ قوتویەكی كرد، هەڵیگرت و لێی دا ڕۆیشت.

كە كەوتە لای ئێوارە ڕۆن گەرچەكەكەی خوارد و بەدزییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. ژنە ئەو شەوە كە مێردەكەی لە ماڵ نییە خۆی لە سەپانەكە

بە تەواوی خۆش کردووە. پیاوەکە هاتەوە لە دەمەدەمی خەوتنانا چوو بەبێ دەنگ سەپانەکەی لەناو جێگە هەستان و پێی وت: ڕۆڵە ویستم بچم بۆ شار لە ڕێگادا تووشی پیاوەکەی کوێخا نادر بووم ناردبووی کە سبەینێ دێت بۆ ئێرە، لەبەر ئەوە من گەڕامەوە. هەستە تۆ لە باتی من بچۆ بۆ شار شتومەکەکان بکڕە و خێرا بەیانی بگەڕێوە، عەیبە کوێخا نادر بێت و من لە ماڵ نەبم. سەپان لێی دا ڕۆیشت و ئەمیش چوو لە شوێنەکەی ڕاکشا.

دوو کەرتی شەو ڕۆیشتبوو نەڕۆیشتبوو، کوێخا ژن ئاگری جگەر هەڵیئەگرێ و ئەچێتە سەر جێگای سەپانەکە. نە لەو دەنگ و نە لە مێردی بە سەپان ناسراو دەنگ، بە هێواشی خۆی ئەدا بەسەر مێردی لە شوێن سەپان نوستوودا. مێردەش دەعباکەی لەسەر چزە، چونکە هەر لە پێشەوە خۆی بۆ ئامادە کردووە. ژنەش نازانێ ئەمە مێردەکەی خۆیەتی، بەڵکوو هەر لای وایە سەپانەکەیە.

مێردەش ڕۆن گەرچەکی خواردووە سکی کەوتۆتە کار، لەو وەختەدا کە ـ بلامانێ ـ ڕەحەت ئەبێ ئەفیرێنێ بە ناوگەڵی ئافرەتدا. ئافرەت کە لێ ئەبێتەوە بە پاشەڵ و ناوگەڵێکی گواوییەوە ئەگەڕێتەوە، ئەچێ هەموو لەشی خۆی ئەشوا، بەو شەوە تووشی ئەو عەزیەتەش ئەبێ.

بەیانی زوو مێردەکە هەڵئەستێ ئەڕوا، ناکاتە کارێ کە ژنەکەی پێی بزانێ. سەپانەکەش دیار نییە، ژنە وا ئەزانێ کە سەپانەکە لە تەرێقییا زوو گاکانی داوەتە پێش و چووە بۆ جووت، ئەوەندە هەبوو گاکانیش کابرا بەیانی کە دەرچووبوو بردبوونی بۆ جووت. لەولاوە سەپانەکە لە شار ئەگەڕێتەوە، کابرا شتومەکەکانی لێ وەرئەگرێ و گاکان ئەدا بەو و خۆی ئەگەڕیتەوە بۆ ماڵەوە و هیچ قسە نابێ ئیتر.

ڕۆژی دوایـی سەپانەکە وەکوو جاران کە لە خەو هەڵئەستێ خۆی ئەکێشێتەوە. ژنەکە ئەڵێ: ئەرێ پیاوەکە ئەوە ئەو سەپانە سەگبابە بۆچی هەموو بەیانییەك کە لە خەو ڕاست ئەبێتەوە خۆی ئەکێشێتەوە؟

پیاوەکـەش ئەڵـێ: ژنەکـە پێم نەوتی ئـەوە دەردەکێریـەتـی. ژنە ئەڵێ: «ئائا دەردە کێریـەتی، ئەوە دەردەگوویـەتی ئەو باوەحیزە».

١٧٢. کابرایەکی «گەڕووسی» تلیاکی، چووە سەر ئاودەست، ئەینقان، ئەیشیڕان، ئەینالاڵان، ئەیبۆڕان، هیچی لێ دەرنەئەچوو. لە تاوانا دەستی کرد بە گریان هەر هیچی بە هیچ نەکرد. وای لێهات عەرەقی ڕەش و شینی دەردا و لەسەر ئاودەستەکە سارد بووەوە. لە پاش ئـەوە هەناسـەیەکی پیا هاتەوە دەسـتی پێ کردەوە ئەیوت: «بەدمەسـەو بەوە بیروون، قوربونت بووم بەوە بیروون، خوێنمە وە ئاو کردی بەوە بیروون، خۆم ئەخۆمەت بەوە بیروون، ئەپەرسمەت بەوە بیروون، نماز ڕات ئەکەم بەوە بیروون».

لە پاش دوو سەعات بە هەر نق و جقێك بوو بە ئەندازەی گوو مشکێکی وشکی ڕەشی لێ کەوتە خوارەوە. هەڵیگرت چەند جارێك ماچی کرد و خستیە سەرچاوی و وتی: قوربوون ئەو ڕەنگ و ڕوخسارەت بووم، دیدار وە قیامەت».

١٧٣. کابرایەك گەڵوگونی «ئاگر»ی گرتبوو، لە کرماشان ئەچێتە لای دوکتۆرێـك بـۆ دەرمانکردنـی. دوکتـۆر ماوەیەکـی زۆر لەگـەڵ دەعبای کابرادا خەریك بوو، ششتی، دەرمانی کرد و پێچای، ئەمجا کابرا دەستی برد چوار قرانی لە بەردەما دانا. دوکتۆر تووڕە بوو وتی: «کاورا! تۆ هیـچ شـەرم نیەکـەی؟ من یەی سـەئات وە تەك کیر تـۆ وازی کردم چوار

قـەڕان وە پێم دەی. تۆ بـەو چارەك سـەئاتێ وە کیر من وازی کە بیست قەڕان وە پیت ئەدەم!».

١٧٤. کوڕێك لەو شارەزوورە ژنیان بۆ هێنابوو، لەناو زەماوەندەکەدا کوڕە تووشی بووکەکە بووبوو پێی وت: «شەوێ کە هاتمە لات چی بکەم؟» بووکەکەش پێی وت: چی ئەکەی؟ ئەوی سەگ ئەیکا تۆیش ئەوە بکە.

شەو کە هاتە وەختی پەردە، بووك و زاوا چوونە پەردەوە تا بەیانی. لە بەیانیا لە بووکەکەیان پرسی: ئیمشەو زاوا چی لەگەڵ کردی؟ وتی: «هیچ، تا بەیانـی دە جـار هـات کابراکـەی ئەلستـەوە و ئەگەڕایـەوە دواوە بـۆلای دیوارەکە پیا هەڵئەمیزا و ئەهاتەوە بۆلای من»!.

١٧٥. ژنێك هەبوو لەناو باخێکا لەگەڵ مێردەکەیا پێکەوە نوستبوون. ژنـە دۆستێکی هەبـوو هـات بـۆلای و لە پاڵیـا ڕاکشـا. ژنە پێی وت: هەستە ئیش بکە مێردەکەم خـەوی گرانە ئاگای لێ نابێ، کابرای دۆسـت وتـی: ئەترسم. ژنـە دەستی بـرد موویـەکی لـە قنگـی مێردەکەی هەڵکەند و دایە دەست کابرا و وتی: هەستە ئیش بکە چاوت لێیە خەوی چەند گرانە؟ ئەو مووەم لێی هەڵکەند خەبەری نەبووەوە. کابرای دۆستە هەر وتی: ئەترسم. ژنە موویـەکی‌تری هەڵکەند، مێردەکەی هەر خەبەری نەبووەوە بەڵام کابرا هەر نەیئەوێرا. خۆلاسە ژنەکە موویـەك و دوو و سێ و دە و بیست مووی لە قنگی مێردەکەی هەڵکەند، کابرا هەر نەیوێرا. لە ئاخـرا مێردەکـە خەبەری بـووەوە و گوێی لە گفتوگۆیان بوو وتی بە کابرا: «هەسـتە سـەگباب ئیش بکە ئەگەر تۆ وابکەی ئەم قەحبەی ماکەرە تا بەیانی موویـەك بە قنگی منەوە نایەڵێت».

١٧٦. لەو سەرە کچێك لەگەڵ کوڕێکا لەلای «ڕان» ئەبن. دایکی کچە هەموو جار بە کچەکەی ئەوت: «کچەتیو! ئەترسم ئەگەر لەگەڵ ئەو کوڕەدا یاری بکەیت داوێنی کراسەکەت بدڕێت».

ڕۆژێك لە دەشتەوە یارییان ئەکرد بەدەم یارییەوە بە گاڵتە ئەوەشیان کرد و کچێنی کچەکە نەما. کچەکە وتی: ئای ئەوە بۆ داوێنی کراسەکەمت دڕی؟ کوڕەکە وتی: ئێستە بۆت ئەدروومەوە!. سەرلەنوێ تێ هەڵچوونەوە. کچەکە زۆری پێ خۆش بوو وتی: دیسان بیدروووەوە. بۆی درووەوە. فرە خۆش بوو وتی: جووت بەقیەی بکەوە. کوڕە هەناسەیەکی وای تیا نەمابوو وتی: «ئیتر دەزوو نەما». کچەکە هەردوو هێلکەگونی کوڕەکەی گرت و وتی: «هەی فێڵبازەی درۆزنە ئەوەتە دوو گلۆڵە دەزووت لێرەدا شاردۆتەوە!».

١٧٧. شێخ فەتاح گێڕایەوە وتی: لەو ناو جافەتییە پیاوێك هەبوو «لالەحەمە»ی ناوبوو. هاتوچۆی گۆڕانەکانی ئەکرد. ڕۆژێ کابرایەکی خێڵەکەی خۆیان ژنەکەی ئەمرێ، دێتە لای لالەحەمە ئەڵێ: «برا تۆ لە قنگی شێخ و مەلادا گەورە بووگی بێ بزانە چۆن ئەوێ و چۆنی بشارینەوە؟»

ئەویش ئەچێ ئەڵێ: «برا! قازانێ ئاو بێرن قومە ئاوێکی تێ کەن و گەرمی کەن». ئەمجا ئەڵێ: «چیغێك بێرن تەرمەکە بخەنە سەر چیغەکە، میمکە «فەوجی»ـش بێت لەسەری بوێسێ، قازانە ئاوەکە بکەن وە ملیا پشیلەشۆری کا».

پاشان ئەڵێ: «ئا لەو گۆشەوە قمە چاڵێکی بۆ بکەن، لوولی دەن وە تۆپە جاوگێکەوە بیخەنە چاڵەکەوە». ئەوانیش وای لێ ئەکەن، بەڵام چاڵەکە قووڵ نابێ هێشتا گەلێکی بە دەرەوە ئەبێ. ئەڵێن: لالەحەمە

کوچکت لێ نەوارێ خۆ هێشتا چاڵێکی تریشی گەرەکە. ئەڵێ: «کورە نەیگەرەکە بی‌قەمچێننەوە».

ئەمجا کابرای مێردە ئەڵێ: برا دەی تەڵقینەکەشی بخوێنە. ئەویش ئەڵێ: «برا بۆ من نەهاتگە، من فێرت ئەکەم خۆت بیخوێنە». ئەڵێ: برا خاسە. ئەڵێ: «ئائەم پەنجەتە ڕاست کەرەوە سێ فیکە بکە وە دەور قەورەکەیا و بێژە فرەم کردگە وە کونێتەوە».

بەم جۆرە ئەینێژن و کابرا هەنگی گریان بەری نادا، کە سەیر ئەکا خەڵکەکە هیچ ناگرین ئەویش ئەڵێ: «ئەرێ دەویت باوکینە! ئەوە بۆچی ناگرین؟ خۆ هەر ژنی من نەو، ژنی گشتمانوو».

.١٧٨ دەروێشی «کەڵوڕ» لەو کوردەوارییە بە گوندەکانا ئەسووڕێنەوە، هەریەکە کراسێکی درێژ لەبەر ئەکەن، پرچێکی لە شانە دراویان بەر داوەتەوە، دەفێك ئەخەنە نەڕەی شانیان، تەزبیحێکی دەنك گەورەشیان ڕاست و چەپ خستۆتە ملیان. کە ئەگەنە قەراخ ئاوایی دەفەکە ئەگرن بە دەستەوە بە بەر ماڵەکانا ئەسووڕێنەوە و بە دەم دەف لێدانەوە گوایە زیکر ئەکەن ئەڵێن: «هۆ عەباس، تەیرێ مەیرێ کاینات، هۆ دایە گەورە ئەمە بە دەرکی کونات، چیزێ میزێ ڕای دەروێش بنێرە».

.١٧٩ دەروێشی گژنی زەبەلاح زەبەلاح بە لادێکانەوە بەسەر خەرمانانا ئەسووڕێنەوە بۆ دەرۆزە و خەرمانلۆخە. توورەکەی گەورەگەورەیان پێیە، هەموو شت کۆ ئەکەنەوە؛ لە گەنم و لە جۆ، لە کەشك و ساوەر، لە شەکر و چا، لە ڕۆن کە ئەیکەنە ناو کوولەکەیەکی مل باریکەوە و پەتێکی پێوەیە خستوویانەتە ملیان. ئەگەر بۆیان ڕێکەوێ دزیشی

بەدەمەوە ئەكەن. ئەمانەش زیاتر جووتە ئەگەڕێن. دەفیشیان كردۆتە ملیان بەدەم دەف لێدانەوە مناجات ئەكەن.

ڕۆژێك لە بەر ماڵێكا یەكێكیان خاكەنازێكی بەرچاو ئەكەوێ، بەدەم دەف لێدانەوە هاوڕێكەی تێ ئەگەیەنێ بەم زیكرە، بۆ ئەوە هەڵیبگرێ ئەڵێ: «كلكی درێژە و دەمی پانە، دایكەنە و بیخە هەمانە، بۆ خەرجی ناو بازاڕمانە، مەدەد یا غەوسی گەیلانی».

١٨٠. لەو دەشتی دزەییە فەقێیەك هەبوو «مەلا برایمی مەشهوور»یان پێ ئەوت. ئەم مەلا برایمە هەم سەر و فەساڵ و هەم كردەوە و قسەی لەوانە بوو هەموو كەسێكی ئەهێنایە پێكەنین. ئەمەش هەر خۆی لە خۆیا وابوو، وەنەبێ بە عەنقەسی وای بكردایە.

مەلا برایم ئاوەڵ مستەعدێكی ئەبێ. سوختەكە ڕۆژێك مەلا برایم تووڕە ئەكا، مەلا برایمیش پێی ئەڵێ: «كێرت بە قنگی مەلا یەحیای مامۆستات! ئەگەر مامۆستاكەت پیاو بوایە تۆیش پیاو ئەبوویت». سوختە ئەچێ ئەمە بۆ مەلا یەحیای مامۆستای ئەگێڕێتەوە. مەلا یەحیا لەم قسەیە زۆر تووڕە ئەبێ، وەكوو فیشەكە شێتە ئەچێ بە ئاسمانا. كوتەكێكی ئەبێ هەڵیئەگرێ و ئەچێ بۆ مەلا برایم. كە ئەگاتە بەردەمی مەلا برایم كوتەكی لێ هەڵئەسوورێنێ و ڕووی تێ ئەكا ئەڵێ: مەلا برایم! نەڵێیت بە حیزی هاتۆتە سەرم، ئەم كوتەكەت چاو لێیە؟ تۆیش هەڵسە بكەوەرە خۆت، یا من سەروگوێلاكی تۆ ئەنێمە یەك، یا تۆ من لەناو ئەبەیت. ئیمڕۆ یەكێكمان ئەبێ لە دەست یەكێكمان بیخۆین. قسەیەكی وات نەكردووە شوێنەكەی سارێژ بێتەوە.

مەلا برایمیش ئەڵێ: ئەی چۆن؟ جا شەڕ كەی وا ئەبێ؟ شەڕ ئەوەیە

کە ئەبێ تۆ بچی لەولاوە دابنیشی دەست بکەی بە قسەکردن، منیش دەست بکەم بە قسە؛ لە هەوەڵەوە بە نزمی، لە پاشا بە توندی.

ئەمجا هەردووکمان لە یەك زیت بینەوە، تۆ دەست بکەی بە جنێودان، من بڵێم: کەم گوو بخۆ. تۆ بڵێیت: ئەوە بە کێ ئەڵێی کەم گوو بخۆ؟ من بڵێم: باوەحیز بە تۆ ئەڵێم. ئەمجا تۆ ڕاست بیتەوە، منیش هەستمە سەر پێ. تۆ هەنگاوێك بێیتە پێشەوە، من قۆڵم هەڵکەم، تۆ تووڕەتر بیت، هەنگاوێکی‌تر بێیتە پێشەوە. ئەمجا منیش بێم باوەش بکەین بە یەکا، لە من زیل و لە تۆ بەم. دەست لە دەست و قەوەت لە خوا، تا یەکێکمان ئەکەوینە توونی بابە عەمرەوە. برا شەڕ ئاوا ئەبێ، کەی بەو جۆرە ئەبێ کە تۆ بۆی هاتوویت؟

کە مەلا برایم ئەمانە ئەڵێت، مەلا یەحیا جوان و پوخت خاو ئەبێتەوە و دەست ئەکا بە پێکەنین و ئەگەڕێتەوە دواوە.

١٨١. شێخ حەمەغەریب مودیری ناحیەی قەرەداغ بوو. لە سەردەمی حوکوومەتی شێخ مەحموودا شێخ کردی بە وەزیری داخلیە. ئەویش وتی: «ئەبێ مودیر ناحیەتەکەم هەر بمێنێ». منیش ـ بەڕەحمەت بم ـ کردمیان بە وەزیری ئەوقافی کوردستان.

مزگەوتە شڕێکم هەبوو لە بەغدا، وتم: بە مەرجێك ئەبم، کە مزگەوتە شڕەکەم بمێنێ بە دەستەوە. بەڵام ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو مزگەوتە حەقێکی زۆری بەسەر منەوە هەبوو، چونکە گەلێ کتێبم لە حوجرە پەرپووتەکەیا دانا؛ یادت بەخێر!



# قسەی نەستەق

١٨٢. سەی حسێن هەبوو لە «سنە» کوێری زکماك بوو، تاوس بازی ئەکرد. قسەی نەستەقی هەبوو. جارێ بە شەو ئەچێ بۆ سەر ئاودەستەکانی مزگەوتی زیارەتان، چرایەك لەگەڵ خۆی ئەبا. پیاوێك ئەچێتە ئەوێ و ئەسڵەمێتەوە، لە پاشا لێی ئەپرسێ: سەی حسێن تۆ کوێریت چرات بۆ چییە؟ ئەڵێ: «بۆ یەکێکی وەکوو تۆ کە هاتیت نەوەك چاوت نەبینێ بکەوی بە سەرما».

١٨٣. کابرایەك هەبوو لەو سەرە لەناو خەڵکا پێیان ئەوت: «ڕەشوبۆر». ئەم کابرایە سەروسەودای لەگەڵ سەگدا زۆر بوو، خەڵکوخوا شتیان ئەدایە، هەرشتێکی بە دەست ئەکەوت ئەیدا بە سەگ. بە درێژایی ساڵ ڕەوەسەگێکی بەدەورەوە بوو. بە شەویش هەر لەناو ئەوانا ڕۆژی ئەکردەوە.

جارێك نازانم لەبەر چی ئەبێ خۆی لە سەگەکان ئەدزێتەوە. تەنها دوو سەگ لەگەڵ خۆی ئەبا، لە شوێنێك دائەنیشێ و سەگەکان بە لایەوە قنچکە ئەکەن. ئەم سەگانەش یەکێکیان ڕەش ئەبێ و یەکێکیان سپی. کابرایەکی مەڕدار بەوێدا تێئەپەڕێ پێی ئەڵێ: ڕەشوبۆر یەکێ لەم سەگانەم پێ نافرۆشی؟ ئەڵێ: کامیانت ئەوێ؟ ئەڵێ سپییەکە. ئەڵێ: «سپیەکەم لە ڕەشەکە خۆشتر ئەوێ». ئەڵێ: دەی ڕەشەکەم پێ بفرۆشە. ئەڵێ: «ڕەشەکەم لە هەردووکتان خۆشتر ئەوێ».

١٨٤. بەرخە جوانەکەش قسە ئەکا!. ئەڵێ: جارێك بەرخێك لەسەر تاوێرێکەوە بوو، گورگێك بە بەردەمیا تێپەڕی و دەمی نەیگەیشتێ. پێی وت: بەرخە جوانەکە نایەیت ببی بە میوانم لەماڵەوە؟ بەرخەکەش وتی: «ئای ئەمە چەند سەربەرزییە بۆ من کە میوانی گەورەیەکی وەکوو جەنابت بم؛ بەڵام ئەگەر ماڵەکەت سکت نەبێ».

١٨٥. کوێخا کامەرانی خوسرەوی ڕوغزایی ئەچێتە دێی «کەچەڵ میانە». لە ئاغەکەی کەچەڵ میانە ئەپرسێ: «ئاغا ئیمساڵ تروتفاقتان چۆنە؟» ئەویش ئەڵێ: «کوێخا لەسەری سایەی ئێوەوە تڕ زۆرە و تفاق کەم».

(کەچەڵ میانە کەوتۆتە جنووبی شاری سەقزەوە. ڕێبازی جاف بووە)

١٨٦. شا شا، دەمارەکۆلیش قسە ئەکا!. لە دووپشکیان پرسی: بۆچ بە ڕۆژ دەرناکەوی؟ وتی: لەبەر کردەوەی شەوم.

١٨٧. بابەشێخی شێخ عومەری بالیسان بۆی گێڕامەوە وتی: لە سەردەم حەمەپاشای ڕەواندزدا ئاغایەك لە دەوروبەری «وەلاش» هەبوو تۆزێ سەری لە گەورەیی ئەخورا، لەگەڵ ئەوەشا هەر لە ژێر قەڵەمڕەوی «پاشای کۆرە»دا بوو.

پاشا پیاوێکی نارده سەری بۆ دەیەك و مەکات. ئاغەکە دەماری گەورەیی دەستی کرد بە جووڵەجووڵ لە لەشیا و پیاوەکەی دەرکرد و هیچی نەدایە. ئەم ئاغەیە گردێك لە تەنیشت قەلاتەکەی بوو، پاشای کۆرەش جۆگە ئاوێك لەبەر قەلاتەکەیا بوو. کابرا چووەوە و کارەساتەکەی بۆ میر گێڕایەوە. میر تیك چوو، ئەمجا کابرا وتی:

ئەگەر میر خورتە تخوب گردە    ئەگەر میر زراوە تخوب ئاوە

١٨٨. هەر ئەو گێڕایەوە وتی: جەمیل ئاغای «بەحرکە» و مەجیدئاغای «دێرێ» هەردووکیان برابوون و لە عەشیرەتی «گەردی» بوون. گوندێکی زۆریان هەبوو. جەمیل ئاغا دەستی بەسەر هەموویانا داگرتبوو، سەرباری ئەمە بە تەما بوو «دێرێ»ـش داگیر بکا. لەو گوندانەش کە هەیبوو یەکێکیان «هەرشەم» بوو. ئەم قسەیەش بڵاو بووبووەوە کە ئەیەوێ «دێرێ»ـش داگیر بکا. چونکە هەموو جار ئەیوت: ئەگەر خوا بدا دەمێ، دێرێش دەخەمە سەر هەرشەمێ. مەجیدئاغاش ئەیوت: ئەگەر خوداش نەدا دەمێ، سەد کێر بە دێرێ و دووسەد بە هەرشەمێ.

١٨٩. جوولەکەیەك ئەچێتە «بیجاڕ» و ئەبێ بە پێنج مەزەب. لە پاشا ئەچێتە «سنە» و لەسەر کۆڵانەکان دەست ئەکا بە دەرۆزە کردن و ئەڵێ: مەردمگەل نەوموسوڵمانم شتێکم بدەنێ. کابرایەکی سنەیی لێی ئەپرسێ: چی بوویت بووی بە چی؟ ئەڵێ: جوولەکە بووم و [بووم] وە پێنج مەزەو. کابرای سنەییش ئەڵێ: «هەی لەم گووبەگووە تۆ کردگتە، گوو وە ڕیش باوك ئەو کەسە شایێکت پێ‌بدا».

١٩٠. جارێك پیاوێك لە سولەیمانی ئەچێتە بەر دەرگای ماڵی شێخ بابەعەلی تەکیەیی، دەرگاکە داخراوە، دەست ئەکا بە لێدانی. شێخ بابەعەلی لە ژوورەوە ئەبێ ئەڵێ: ئەوە کێیە؟ کابرا ئەڵێ «منم». ئەویش ئەڵێ: «من ئەو کەسە ناناسم کە ناوی "منم"ـە؛ بڕۆ خوات لەگەڵ».

١٩١. کۆڕ کە گەرم بوو لە هەموو جۆرە قسەیەك ئەکرێ. لە ئیبراهیم ئەحمەدم پرسێ: «لە باری ژیان و گوزەرانەوە تۆ و شای حیجاز چ جیاییەك هەیە لە بەینتانا؟»

هەندێك ڕاما و پاشان وتی: «جیاییەکەمان ئەوەیە ئەو گیرفانی

قاسەکەیەتی، من قاسەکەم گیرفانمە».

١٩٢. لەو موکریانە پیاوێك هەبوو «قەرەنی» ناوبوو، جووتێ «گا»ی هەبوو، جووتی پێ ئەکردن. لەسەر ئەم گایانەش گەلێ قەرزار مابووەوە، چونکە قەرزی بەسەرەوە کردبوون بۆ وەختی حاسڵات. ڕۆژێك لە کاتی وەرد بڕیندا گایەکان مانیان گرت و خۆیان دا بە زەویدا. هەرچەندە کابرا لێی دان و هاواری کرد بە سەریانا هیچ کەڵکی نەبوو. ئەو مانە گرتیان هەر گرتیان. لە ئاخرا کابرا وەڕس بوو چوو لە تەنیشتیانەوە ڕاکشا و نوست وتی: «گابازە و گازەردە! ئەوا منیش هاتم لە تەنیشت ئێوەوە ڕاکشام، بزانین خاوەن قەرز بێت کاممان ئەبات؟».

١٩٣. شێخ مەحموودی مەلیك دەستبەسەر بوو لە بەغدا. بە دەستووری شێخ مەحموو دیواخانێکی ڕاکێشابوو، لە شێخەکانی عەرەب و لە پیاوانی حوکوومەت هاتوچۆیان زۆر ئەکرد. هەموو دەم دیواخانەکەی ئاوەدان بوو؛ بەتایبەتی کوردەکانی چ بەغدا و چ دەرەوەی بەغدا، هەر زۆر زۆر ئەچوون. ئەو کوردانەی کە لە دەرەوەی بەغدا ئەچوون بۆ خزمەتی، زۆری ڕێز لێ ئەگرتن، لەناو ئەمانەشا هەبوو کە پۆشتە و پەرداخ نەبێت.

ڕۆژێك ئەوا گەلێ لە شێخە عەرەبەکان و کاربەدەستە گەورەکانی حوکوومەت لەوێ ئەبن، لەو کاتەدا چەند کوردێکی لادێیی لە وڵاتی سولەیمانییەوە دێن بۆ خزمەتی، شێخ ڕێزیان زۆر لێ ئەگرێ. یەکێ لە پیاوە گەورەکانی حوکوومەت کە لەوێ دانیشتبوو ئەڵێ: «یا شێخ! ئەم ڕووتەڵانە چین وا تۆ بەو جۆرە ئەچی بە شانوباڵیانا و ڕێزیان لێ ئەگری؟» شێخ مەحموودیش لە وەڵاما ئەڵێ: «ئەگەر ئەم ڕووتەڵانە کە

تۆ ئەیانلێیت نەبن، من ئەم شێخ مەحمووده نابم».

١٩٤. یەکێ لە بەگەکانی جاف ئەولادێکی بێ‌کەڵکی ئەبێ، پیاوێکیشی ئەبێ حەمەعەلی ناو ئەبێ. ڕۆژێ دەردەدڵ ئەکا لەلای حەمەعەلی ئەڵێ: حەمەعەلی بەخوا وەجاغم کوێره. حەمەعەلیش لەبەر خۆیەوه ئەڵێ: «بەخوا میرم باوکیشت هەر وەجاخی کوێر بوو».

١٩٥. ئاحەمەعەلی هەبوو لە سنە «زاوت»ـی «آصف الدّیوان» بوو. پیاوی ئەعیانەکانی سنە خۆیان بە شتێك ئەزانی. ڕۆژێك ئەم ئاحەمەعەلییە لە پیاوێك تووڕە ئەبێ و پێی ئەڵێ: «سەگ‌باوك! سەد تمەن بدەم تمەنێکت لێ بستێنن؟!».

١٩٦. ساڵێك لەو وڵاتە «شەهید» باوی پەیدا کردبوو، هەرکەس ئەمرد ئەیانوت: شەهیده. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوه وتی: عەبەی مەلاحەسەنی دەرەویانی هەبوو ئەیوت: «جەحەنەم لەبەر شەهید، ناشوکری نەبێ، بەر کەس ناکەوێ».

١٩٧. پیاوێکم لابوو مام پیرداودی ناو بوو، جارێك هەر وا قسە لە مردنەوه ئەکرا کە مردن هەموو کەس ئەچنێتەوه. ئەویش وتی: «مامۆستا ئەوی بوو، مرد!».

١٩٨. «عبدالرّحیم» و «عبدالرّحمن» لە سولەیمانی دوو بران، ئەوەنده لە یەك ئەچن لە هەموو کەس تێك ئەچن. «ڕاز» کچی دوکتۆر «عزّالدّین» ڕۆژێ چاوی بە یەکێکیان ئەکەوێ، ئەم کچەش تەمەنی لە بەینی چوار، تا پێنج ساڵانەیە، ئەڵێ: «بابە ئەو پیاوەی لە پیاوێك دوو پیاویان هەیە چاوم پێ‌کەوت!».

جا وەرە تۆ ئەم قسەیە هەڵێنە و لێی ورد بەرەوە؟

.١٩٩ شێخ بەشیر بۆی گێڕامەوە وتی: باسی مودیر ناحیەیەك ئەکرا کە بکرێ بە قائیمقام، یەکێك لە کۆڕەکەدا بوو لێیان پرسی: ئەو پیاوە چۆنە؟ وتی: «وەڵلا پیاوی چاکە، بەڵام درەنگ تێ ئەگا و زوو لە بیری ئەچێتەوە».

.٢٠٠ مەلا فایەق هەبوو لە سولەیمانی خۆی دەستی شێتێتی هەبوو ئەیوت: «شێتی زۆر خۆشە تا منالان پێیان نەزانیوە؛ کە پێیان زانی ئیتر گووی تێ ئەبێ».

.٢٠١ سەردەمێك بوو «بارانە» وەرئەگیرا لە سولەیمانی. لەو لای «کانی‌دۆمان»ـەوە قۆڵچی ڕاوەستابوو [بۆ] ئەو بارانەیە. کابرایەکی «وێلەکە»یی هەندێ دیزە و گۆزەی کردبووە ناو هۆڕێك و نابووی لە گوێدرێژێك، هێنابووی بۆ سولەیمانی بۆ فرۆشتن. کابرای قۆڵچی بە خۆی و بە دارەکەیەوە ئەگاتە سەر بارەکە و دارێکی باشی لێ ئەدا و بە کابرا ئەڵێ: بارەکەت چییە؟ کابرای خاوەنباریش ئەڵێ: «قوربان ئەگەر دارێکی‌تری وای لێ‌دەی هیچ!».

.٢٠٢ «آصف الدّیوان»ـی سنە گەلێ دێ و ناوچە و گوندی هەبوو. ئەم گوندانە لە ساڵێ «زاوت»ـی ئەنارد حاسڵاتیان بۆ وەرئەگرت. هەر لە زەمانی باوباپیریانەوە کە ئەمانە خاوەن مڵك بوون، بەم جۆرە بوون بۆ کردنەوەی حاسڵات و مڵکانە.

کوڕێکی خەڵکی شاری سنە کە ناوی «میرزا نەسروڵلا» بوو، پاش ئەوە کە خوێندن لەو وڵاتە تەواو ئەکا ئەچێ بۆ فەڕەنسە، لەوێ شەهادەیەکی

بەرز وەرئەگرێ و ئەگەڕێتەوە. ویستبووی لەلای [ئاسەف دابمەزرێ،] ئاسەفیش ئەمەی بەلاوە خراپ نەبوو. میرزا کەوتە ئیش کردن، بەڵام هەر ڕۆژە نە ڕۆژێك شتێکی ئەدۆزییەوە و قەوانێکی ئەخستە کار. ئەمەش هەموو لەبەر ئەوە بوو کە شەهادەی لە فەڕەنسەوە هێناوەتەوە، لەوانە بوو نە لووتی بە ئاسەفدا ئەهێنا و نە بە هیچ کەسێکی‌ترا. لە ئەنجاما ئاسەف گەیشتە تینی و ئیتر پێی هەڵنەگیرا وتی: «بەو ئاغایە بێژن حەفت تەغار گەنم و جۆ ئەدەین بە یەکێ حەساوەکەمان بۆ بکا. ئێمە حەفتە بیجاڕی خۆمان هەس لەناو شیشەکانا، حەفتەبیجاڕی فەڕەنسەمان گەرەك نییە!».

٢٠٣. مەلایەك هەبوو مەلا عەبدولباقی ناو بوو، لە سنە لە مزگەوتی «دارُالإحسان» ئیجازەی عیلمی لە مەلا حەمەڕەشیدی مودەڕڕیس وەرگرت. ئەوا لەو ئیجازەیەدا هەڵپەڕکێ و ئاهەنگە. فەقێکان بە زۆر پەلی مەلا عەبدولباقییان گرت و وتیان: ئیجازە هی تۆیە و شادی بۆ تۆیە، ئەبێ بۆ پیرۆزی بێیت یەك دوو دەور سەرچۆپی هەڵپەڕکێکە بگری بە دەستەوە. بەم جۆرە کێشیان کرد و بردیان، ئەویش دەستی کرد بە سەرچۆپی کێشان.

مەلا لوتفوڵڵایەکی «زۆنج»ـی هەبوو لە ئیجازەدانەکە سەیرێکی مەلا عەبدولباقی کرد و وتی: «شا شا، تواشای کە چارەکێ نانی بوو ئەویچی بڕیا. ئێستە لە خۆشییا پێ ئەکوتێ بەزەویا!».

٢٠٤. «خلك»ـی مستەفای پیروەیس لە شارەزوور هەستوونی دەوارەکەیان تێك ئەچێ، لەگەڵی خەریك ئەبێ بۆ ئەوە ڕێکی خاتەوە. مستەفای باوکی پێی ئەڵێ: «ڕۆڵە چاکی مەکە با خراپ نەبێ».

ئەڵێ: «باوە تا خراو نەوێ چاك ناوێ».

٢٠٥. مەلا بەها هەبوو لە بیارە ئەیوت: «کە پیاو بەلای گۆڕستانا ئەڕوا دڵی لە"ئاوێسەر" و "حەوشوبارانی"ـش هەڵئەکەوێ».
ئەیانوت: قوربان بۆچی؟ ئەیوت: خوا ئەیزانێ ئەمانەی کە لێرەدا ڕاکشاون چ نازداران و چاوکاڵان و شۆڕەسوارانێکن. بە چیدا ئەزانین ئاوێسەر و حەوشوبارانیش لە ژێرەوە پڕ نین لە مانە و لە سەرەوە وا گوڵاڵە و هەڵاڵە ئاخڵەیان داوە؟. ئاوێسەر: دیمەنێکە لە «تەوێڵە» و حەوشوبارانیش بەسەر «دەرەیمەڕ»ەوە، یەك لە یەك خۆشتر و چاوەندازترن.

٢٠٦. مەلا عەلی قووچەبڵباسی گێڕایەوە وتی: پیاوێکی خەڵکی ئەو سەرە هاتە لام نوێـژ بکا، پیاوەکە منداڵێکی لەگەڵا بوو. نوێژمان کرد و پاشان منداڵەکە ڕووی لە باوکی کرد و دەستی بۆ من کێشا و وتی: باوە ئەوە کێیە نوێژی کرد؟ باوکیشی وتی: ئەوە مەلاگیانە. منداڵەکە لێی پرسییەوە وتی: ئەوە بۆ کێ نوێژی کرد؟ وتی بۆ ئەڵڵاگیان.

٢٠٧. پیاوێك هەبوو لەو شارەزوورە «لالەمارف»ـی ناو بوو، ئەیوت: چوویتە هەر دێیەك لە پێشا چاوێك بە بەردەنوێژ و مزگەوتەکەیانا بگێڕە. ئەگەر ڕێکوپێك بوو، ئەوا ئەو دێیە پیاوی تێدا هەیە!.

٢٠٨. «خلك»ـی مستەفای پیرەویس پیر بووبوو، لێیان پرسی: خاڵە خلك، جیایی لە بەینی پیر و جواندا چییە؟ ئەویش وتی: هەرچەندە بێعەدەبیشە بەڵام پیر ئەندامی ڕەقە و کێری نەرمە، جوان ئەندامی نەرمە و کێری ڕەقە!.

٢٠٩. قسەی من نییە قسەی ڕەحمەتییەکەیە کە لە بارەی وانێکەکەوە فەرموویەتی: «پێیا کێشە وەکوو گا، بیجووڵێنە وەکوو ئەسپ،

بیکێشەوە وەکوو کەر».

٢١٠. جارێـك فایـق بێکەس لە سولەیمانی یاپـراخ ئەخوا، «عەزیز ئەفەنـی قامیـش» ئەچـێ بە سـەریا ئەڵـێ: بۆیـە. ئەڵـێ: فایق بۆیـە مانای چییە؟ ئەڵێ: دواجار پێت ئەڵێم. کە یاپراخەکەی تەواو ئەکا و دەست بە لێو و سمێڵیا دێنێ ئەڵێ: تۆ پرسیت: ئەوە چی ئەخۆی؟ من ئەبێ بڵێم: یاپراخ. ئەڵێی: بەشم بدە، ئەڵێم: نایدەم، ئەڵێی: بۆچی؟ ئەڵێم: بۆیە. کەواتە هەر لە ڕێگاوە لە کورتی ببڕێتەوە باشتر نییە!؟

٢١١. هەمزە هەبوو خەڵکی کۆیـە بـوو. کە شـتێکیان لێ ئەپرسـی ئەیوت: «لەپاش کەرەمی خوا، درۆ».

٢١٢. جارێك مامۆستا «مستەفا زەڵمی» بۆ میسر ئەچوو، پێی وتم: ئێشت نییە؟ منیش وتم: فێستێکم بۆ بێنە. بەبێ وەستان وتی: «لەسەر سەرمی دائەنێم».

٢١٣. کۆڕێك بووین، بڕیار وابوو کە لیژنەیەك هەبێت لە کەلەپووری ئیسـلامەتی بدوێت و بهێنێیتە ناوەوە. ئەو لیژنەیە بریتی بوو لە شێخ محەمەدی خاڵ و یەکێکی تر، وە خاوەنی ئەم کتێبە. یەکەکەی تر تـۆزێ ملپێچی ئەکرد و پێی خۆش نەبوو بچێتە لیژنەیەکی واوە. لەناو ئەو دانیشتووانەدا کە لەو شوێنە هەبوون یەکێکیان مەسعوود محەمەد بوو، کوڕی مەلای گەورەی کۆیە. هەڵیدایە وتی: «خزمینە من ئەبم، خۆ پیاو موسوڵمان ئەبێ، کافر نابێ!».

٢١٤. حاجی محەمەدلاوە هەبوو ئەیوت: «من لە هەموو شتێکا بەختم ڕەشە تەنها لە شووتیدا نەبێ، سپییە!».

٢١٥. ئەحەی بامیە هەبوو، هەموو جار ئەیوت: «ئەگەریان مارە کرد لە مەگەر، کوڕێکیان بوو ناویان نایە کاشکێ!».

٢١٦. باجی پیرۆز هەبوو، پێیان وت: خەڵکی قسەی زۆرت دەربارە ئەکەن. وتی: «بڵێم چی؟ خۆ دەمی خەڵکی قوزی خۆم نییە بیگرم».

٢١٧. کچێك هەبوو لەو سەرە، ڕۆژێك ئەچێ بۆ ماڵی دراوسێکیان بۆ ئاگر. کە ئەچێ بۆ ئاگرەکە دەستی ئەچزێ بە تەنوورەکەدا -بلامانێ- ترێك ئەکەنێ. ئەڵێ: «ئۆف کاول بی! خۆزیا بچووما یە بۆ ماڵی خاڵم». ژنی خانەخوێکەش ئەڵێ: «جا دایکم ئەو خێرە هێناوتە بۆ ئێمە بیبە بۆ ماڵی خاڵت!».

٢١٨. حسێنی مەلا، لە هەولێر قسەکانی بە دانسقە ئەشیان. لەم ئاخرەدا چووبوو بۆ حەج، لە پاش بەجێهێنانی هەموو کار و فرمانێکی حەج، سەر بەرز ئەکاتەوە و ئەڵێ: «خوایە ئەگەر چ خزمەتێکی دیکەت هەنە بفەرموو تا بیکەین!».

٢١٩. مەسعودی کوڕی تایەربەگی جاف ناوچەی «شلێر» -کە بریتی بوو لە چەند دێ- ئەیفرۆشێ بەحامدبەگی جاف بە ئۆتۆمۆبێلە شڕێك و چەند دینارێك. حەسەن بەگ بۆی گێڕامەوە وتی:

شێخ محەمەدی شێخ «حسام‌الدّین»ـی تەوێڵە ئەویش ئەچێ بە دزی باوکیەوە ناوچەی «وەڵەوسێنان» ئەفرۆشێ هەر بە حامدبەگ بە تفەنگێکی دوولوولی ڕاوی و چەند دینارێك.

شێخ حسامەددین ئەو سەردەمە لە خورماڵ دائەنیشت، مەسعوود

بە خۆی و ئوتۆمۆبێلە شڕەکەیەوە لەوێ ئەبێ، شێخ محەمەدیش هەر لەوێ ئەبێ. شێخ حسامەددین ڕوو ئەکاتە شێخ محەمەد و پێی ئەڵێ: «محەمەد ڕۆڵە ئا سواری شلێر بە و وەڵەوسێنان بکەرە شانت و بچۆ لەو [بەرە] چەند پۆڕێکمان بۆ بکوژە».

٢٢٠. «خلك»ـی مستەفای پیروەیس کوڕی زۆر بوو، لێیان پرسی: خاڵە خلك کوڕەکانت کامیان باشن؟ وتی: «ئەوەیان کە نەیەتە دیواخان و مەجلیسەوە». وتیان: ئەی ئەگەر هەموویان هاتن؟ وتی: «ئەوەیان کە قسە نەکا».

٢٢١. ئەحمەدی عەزیزاغا زمانی نەئەوەستا. قادراغای عەتار لێی ئەپرسێ: ئەرێ کاکەحمەد دەنگت نییە. ئەویش ئەڵێ: «ناو بڵێ و جنێو بدەم!».

٢٢٢. ئاڵتوون ئەفەندی هەبوو لە سولەیمانی لە گاورەکانی سولەیمانی بوو. گەڕەکی گاوران و مزگەوتی بابەعەلی دراوسێ بوون. مزگەوتەکە دوو دەرگای هەبوو، ئاڵتوون ئەفەندی بە خۆی و بە سەدارەکەی سەری و بە کەوا و چاکەتەکەی بەریەوە هەموو ڕۆژ دەستی ئەخستە پشتی و لەو دەرگاکەوە بەناو حەوشەی مزگەوتەکەدا تێ ئەپەڕێ، لەم دەرگاکەوە دەرئەچووو، ئەچوو بۆ بازاڕ. بەهۆی ئەم زۆر هاتوچۆکردنە و بەهۆی دراوسێتیشەوە لەگەڵ شێخ بابەعەلیدا سەروسەودایەکی باشیان پەیدا کردبوو.

لەو خوارەش خواجە «شەلەمۆ» هەبوو لە گەڕەکی جوولەکان، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە مەعامەلەی لەگەڵ ئەهلی تەکیەدا ئەکرد هەر جارە کڵاو و جامەدانەکەی ئەکردە سەری و ڕیشە تۆپەماش و برنجەکەی

دەق ئەدا، کەوا و سەڵتەی لەبەر ئەکرد و عەباکەی ئەدا بەشانیا و لە پێشەوە ئەیگرت و ئەهات بۆ لای شێخ بابەعەلی. ئیتر بابەعەلی بوو، گەلێ جۆرە نموونەی لەلا کۆ ئەبووەوە!. ئاڵتون‌ئەفەندی و خواجە شەلەمۆ لە بازاڕا یەکتریان ئەناسی، زۆر جاریش لای بابەعەلی یەکیان ئەگرتەوە، ئەوەندەی‌تر ناسراوییان کۆکتر ئەبووەوە. لەگەڵ بابەعەلیدا بەبێ پەردە بازاڕی هەموو جۆرە قسەیەکیان گەرم ئەکرد. من ناوێرم بڵێم ئەوا موسوڵمانێك و جوولەکەیەك و گاورێك کۆ بوونەتەوە، مەگەر هەر شێخ بابەعەلی خۆی بیوتایە. کە لێیان ئەپرسی وای جواب ئەدایەوە.

ڕۆژێك شێخ بابەعەلی ئەوا لەگەڵ شەلەمۆ و ئاڵتوون‌ئەفەندیدا پێکەوە دانیشتبوون. بە ئاڵتوون‌ئەفەندی ئەڵێ: ئاڵتوون‌ئەفەندی حەزرەتی عیسا گەورەتر بوو یا حەزرەتی مووسا؟ ئاڵتوون‌ئەفەندیش ئەڵێ: قوربان! پرسیاری وا چۆن ئەکەی؟ دیارە حەزرەتی عیسا گەورەتر بوو. ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: «حەزرەتی عیسا مردووی زیندوو ئەکردەوە، کەچی حەزرەتی مووسا زیندووی ئەمراند. حەزرەتی عیسا هەر لە بێشکەدا قسەی ئەکرد، کەچی حەزرەتی مووسا لە پاش هەشت ساڵ هاتە قسەکردن؛ ئەویش ئەوەندە پاڕایەوە لە خوا وتی: خوایە تۆزێ زمانم بەرەڵاکە بۆ ئەوە خەڵك لە قسەم تێبگەن. بەو ناری عەلییە، تا خوا تۆزێ زمانی دایە. چۆن حەزرەتی عیسا گەورەتر نییە؟»

خواجە شەلەمۆ دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو. ئەمجا ڕووی کردە ئاڵتوون‌ئەفەندی وتی: «هەی زۆڵە! تۆ ئەوەندە زیرەکی بۆچی موسوڵمان نابی؟»

ئاڵتوون‌ئەفەندی وتی: «ئەگەر خوا بیەوێ موسوڵمان ئەبم». خواجە شەلەمۆ وتی: وەڵڵا خوا ئەیەوێ، بەڵام شەیتان نایەڵێ. ئاڵتوون‌ئەفەندی

وتی: «کەواتە خواجە شەلەمۆی گوێرەکە من شوێن ئەوەیان ئەکەوم کە بەهێزترە».

٢٢٣. مەلا مارفی کۆکی و مەلا حەمەمینی وەلاش لە دیواخانی قەرەنیاغای مامشا دانیشتبوون، سەریان خستبووە بناگوێی یەك، لەبەر خۆیانەوە قسەیان ئەکرد. قەرەنیاغا وتی: ها مەلاینە ئەوە درۆودەلەسەی چی هەڵئەبەستن؟ خێرا مەلا مارف ئەڵێ: «قوربان ناوی جەنابت بە خێر و چاکە دێنین!».

٢٢٤. مستەفا نەریمان گێڕایەوە وتی: ئەو کابرا جافە کە حەمەپاشای جافی کوشت، ڕۆژێك تفەنگێك ئەگرێ بە دەستەوە، حەمەپاشا بە تەنها لە خێوەتەکەی خۆیا دانیشتبوو. کابرا ئەچێتە ژوورەوە بۆی، حەمەپاشا کە چاوی پێ ئەکەوێ بەو جۆرە ئەڵێ: «دەویت باوك! باوکت وەگاڵۆکەوە نەهاتۆتە ژوورەوە، ئێستە تۆ وە تفەنگەوە دێیت؟» [ئەویش ئەڵێ:] «پاشا! باوکم باوکی نەکوژیاگە، من باوکم کوژیاگە». ئەمە ئەڵێ و تەقەی لێ هەڵئەستێنێ و ئەیکوژێ.

٢٢٥. حەمەدی وەسمان هەبوو ڕێی کەوتبووە ئەو خوارە، لێیان پرسی: خەڵکی کوێیت؟ وتی: «هێشتا ژنم نەهێناوە!».

٢٢٦. لەو وڵاتی خۆشناوەتییە لە گوندی «هەناروێ» مەلاوەیس ناوێك هەندێ پەنیریان بۆ بردبوو. فەقێکانی پەنیرەکەیان خواردبوو، لە هەرکامیانی ئەپرسی ئەیوت: من نەمخواردووە. پەنیر سەری تیاچوو. ئەمجا بە مەلایان وت: وا پەنیرەکە نەما و کەسیش نازانێ کێ خواردوویە؟ مەلاش وتی: «ئاو ئەزانێ پەنیری مەلا کێ خواردوویە».

٢٢٧. «میران»ـی کوڕی دوکتۆر سەلاح میرانی تەمەنی لە شەش ساڵانا بوو. لە هەولێر بە دوو ترِمبێل ئەچووین بۆ هەوارگەی پیرمەم. من هانی ژنەکانم دا و خستمنە ترۆمبێلەکەی دوکتۆر سەلاحەوە و ئەو لێ‌خوڕی. منێ و هەندێ کەسیش لە ترۆمبێلەکەی لای منا بووین. میران لەگەڵ من بوو، هەر کە هاتم سوار بووم، ئەوەندە تووڕە بووبووم لە ژنەکان، وتم: «هەرکەس لەگەڵ ژنا بێ لە جەهەنەمدایە». ئەوەندەم زانی میران بەبێ وەستان وتی: «کەواتە باوکم ئێستە لە جەهەنەمدایە؟».

٢٢٨. ئەم قسەیەی خوارەوە من بە ناوی موفتی زەهاوییەوە بیستوومە، هەرچەندە هەندێکیش ئەڵێن: هی ئیمامی ئەبووحەنیفەیە: جارێك موفتی زەهاوی لە بەغدا ئەچێتە لای سەرتاش بۆ سەر تاشین. موفتی ڕیشی قەڵەم ئەکرد و دانامەیەکی زیادی تێ کەوتبوو. سەرتاشەکە ئەو مووە سپییانە کە کەوتبوونە ڕیشی موفتییەوە یەکەیەکە هەڵئەکەندن. موفتی وتی: ئەوە بۆچی هەڵیانئەکێشی؟ وتی: قوربان ئەگەر هەڵیاننەکێشم زیاد ناکەن موفتی وتی: «کەواتە ڕەشەکان هەڵکێشە!».

٢٢٩. موفتی زەهاوی لە بەغدا هەموو دەم سنگ و بەرۆکی بەدەرەوە بووە. جارێـك کابرایەك پێـی ئەڵێت: قـوربان پیاوێکی زانای وەکوو تۆ کە لەگەڵ والی و هەموو جۆرە پیاوی گەورەدا دائەنیشی، جوان نییە بۆت کەوا سنگ و بەرۆکت بەو جۆرە بە دەرەوە بێ. ئەویش ئەڵێ: «ئەگەر عەیبم هەر ئەوە بێ، ئەوا ئەوەشم شاردەوە». دەست ئەبا کەوا و کراسەکەی ئەداتەوە بەسەر سنگیا.



# ڕووداوەکانی ڕابوردوو

٢٣٠. پێش ئەوە شەڕی جیهانی دووەم بێتە پێشەوە، بەتایبەتی لە ساڵانی (١٩٣٢ - ١٩٣٩) وە بەتایبەتی‌تر ساڵانی (١٩٣٤- ١٩٣٧) خانەقای مەحوی لە سولەیمانی بەهۆی تەڕی و چەشە جوانەکەی مەلا ئەسعەدی مەحوییەوە شوێنێك بوو لەو شوێنانە کە ناونیشانی کۆنی ڕابواردنی سولەیمانی پیشان ئەدا.

مەلا ئەسعەد حەوشەی خانەقای بە گوڵ و گوڵزار و حەوز و قەسرەوە کردبوو بە بەهەشتە بچکۆلەیەك. کە ئەکەوتە شەوانی جومعە و سێشەنبە ئەربابی زەوق و ئەربابی دەنگ لەوێدا کۆ ئەبوونەوە. سەماوەری هەشت تەرخان تێ ئەخرا و قۆریەی عەجەمی ئەخرایە سەر. لە حوجرەوە یا لەبەر هەیوانا، کوڕوکاڵ و فەقێ دائەنیشتن بە گۆیندەیی و بە فنجانێن و بە قسەی خۆش ڕایانئەبوارد. لە کەرکووکەوە شێخ عیزەدین و وەستا خالد و مەلا قادری قەرەحەسەنی، گەلێ جار ئەهاتن بۆ ئەوە شێخ عزەدین و وەستا خالد بە دەنگە مەلائیکەییەکەیان ئەو بەزمە ئەوەندەی‌تر بگەیەنن بە ئاسمان. دەنگی گۆیندەکان و بۆنی گوڵەکان، تۆ بڵێیت لە ئاسمانی خانەقای مەحویدا وەیا لە گیانەکەی مەلا ئەسعەدا هەر لە هاتوچۆدا بن و ڕابواردنی پێشووی سولەیمانیمان بێننەوە بیر؟.

٢٣١. ڕۆژی ١٩٥٦/٩/٩ بوو سەعات پێنجی پاش نیوەڕۆ لەگەڵ حەسەن بەگی مەحووپاشای جافدا پێکەوە لە هەڵەبجە

دەرچووین. ڕووبەڕووی خورماڵ بۆ چاوپێکەوتن و سەیر کردنی مزگەوتە کۆنەکانی ئەو شوێنە مێژووییە. ئوتۆمۆبێل، ئوتۆمبێلەکەی حەسەن بەگ بوو، مەحموو لێی ئەخوڕی. ترمبێلەکە ڕادیۆی تیابوو، قەوانی «سێگا»ی سەیدعەلی ئەسغەری کوردوستانی لە ئێستگەی بەغدادا ئەو کاتە خرابووە سەر. ڕادیۆ کرابووەوە گوێمان لە دەنگە بەسۆزەکەی سەیعەسکەر بوو کە ئەیوت:

**هەر وەك پێشەنگی سەر قافڵەی عەجەم**

**سەحەر نە سـحرای نەجەف ببۆ جەم**

بەو هۆیەوە حەسەن بەگ ئەمەی خوارەوەی بۆ گێڕامەوە وتی:

ئەوا ساڵێ (١٩٢٦ز)، لەگەڵ ئەحمەدبەگی وەسمان پاشادا ـ کە ئەو سەردەمە هەردووکمان جۆشی گەنجایەتیمان بوو ـ لە هەڵەبجە شەوێکی دەمەو پاییز لە ژوورە بچکۆلە تایبەتییەکەی ماڵی ئەحمەدبەگا دانیشتبووین. ئەحمەدبەگ پیاوێکی هەبوو حەمەعەلی ناوبوو، بە حەمەعەلی وت: کە نەیەڵێ ئەو شەوە کەس بێت بۆ لای، بەو نیازە کە ئێمە ئەو شەوە بەزمێکی تاجرانە بگێڕین. ئەحمەدبەگ بە دەستی خۆی هەموو جۆرە خواردنەوە و مەزەیەکی ئامادە کرد و بەڕاستی نەوەك بوو بە بەزمی تاجرانە، بەڵکوو بوو بە بەزمێکی شاهانەی دوور لە هەموو دڵتەنگییەك.

سەرو پێك نرا بەسەرەوە و نەنرا حەمەعەلی لە ناکاو کردی بە ژوورا وتی: ئەوا سەیدێك هات، نازانم چی بکەم؟ ئەو قسەکەی هەر لە دەما بوو کتوپڕ یەکێکی تر کردی بە ژوورا، کە سەرمان بەرز کردەوە زەلامێکی باڵابەرزمان بەرچاو کەوت. باوەشێ مێزەرەی سەوزی بە سەرەوەیە، عەبایەکی ڕەشی ماوەتی بە شانەوەیە، ڕیشێکی ڕەشی پڕی قەڵەمکراوی پێوەیە، وتی: «سەلامون ئەلەیکم» و بەبێ قسە دانیشت. حەسەن بەگ

وتی: بەڕاستی ئێمەش لەو سەر و دیمەنە بە تەواوی شڵەژاین و لە شەرمانا بە پەلەپەل کەوتینە شاردنەوەی قاپە عەرەق و پێك و مەزە و هەڵسواینە سەر پێ و لە بەری ڕاست بووینەوە. کە سەید دانیشت زمانی هەڵهێنایەوە و وتی: «ئاغەگەل بەندە سەی ئەسکەری کوردستانیم. فەرموو دانیشن». کە ئەمەی وت، تۆزێ ڕوومان کرایەوە دانیشتین و بەخێراتنمان کرد. ئەویش تێ‌گەیشتبوو کە ئێمە خەریکی چین. لە پاش تۆزێك وتی: «ئاغەگەل بەزمی خۆتان تێك مەدەن، بەندەیچ ئەربابم. ئەو ئەسپاوگەلە دەرکەن».

ئێمەش دڵێك ڕازی و دڵێك ناڕازی شتومەکەکان کە شاردبوومانەوە هێنامانەوە مەیدان، بەڵام هەر شەرممان ئەکرد و دەستمان بۆ نەئەبرد. ئەمجا وتی: پێکێك بۆ منیچ تێ‌کەن. ئێمە هەم پێمان خۆش بوو هەم پرکێشیشمان نەئەکرد. ئەحمەدبەگ سێ پێکی تێ‌کرد و یەکەمینی دایە دەست ئەو و ئێمەش هەریەکە یەکێکمان گرت بە دەستەوە. سەی عەسکەر پێکی وەرگرت و هەستایە سەر پێ. پێکەکەی نزیکی پێکی ئەحمەدبەگ کردەوە و دای لە پێکەکەی، تەقەی لێ هەستان و وتی: «بە سڵامەتی سەری ئێوە» و نای بە سەرەوە و دانیشتەوە. سەیرمان کرد ڕاستە زۆر ئەرباب بوو، ئەو لە ئێمە گەلێ وەستاتر بوو.

تۆزێ مات بوو، پاشان وتی: «ئاغە پێکێکی‌تر بۆ ئەم ئاغەی خۆتانە تێ‌کەوە». پێکێ‌تری بۆ کرد و دایە، ئەویشی نا بە سەرەوە. سەیرمان کرد وردە وردە ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و دەستێکی بەرز کردەوە. تۆزێ مێزەرەکەی لار کردەوە و لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بە وتن. پاش ماوەیەك کە گەرم بوو، دایە چریکە و دەنگی بۆ بەرز کردەوە. لەگەڵ حەنجەرەکەیا شووشەی پەنجەرەکان کەوتنە شەکوشۆك. ئەوەندەمان زانی خڕ شووشە هەموو

کەوتنە خوارەوە، جامی پەنجەرە خڕەی کرد. کە چاك سەیرمان کرد هەرچێ ئەهلی هەڵەبجەیە بە دەوری ژوورەکەدا کۆ بوونەتەوە لەو نەوایە سەرسام ماون. ئەوی ڕاستی بێ ئێمەش هیچ ئیختیارێکمان تیا نەما و ئەتوانم بڵێم کەوتین.

٢٣٢. تشرینی دووەمی (١٩٣٠)یە، لەگەڵ فەقێ برایمی دۆڵاویدا لە پشدەری ئەودیوو ڕێمان کەوتە «نوورەدین». دەمەدەمی زەردەپەڕی خۆراوا بوو، ڕووبەڕووی دیواخانەکەی «هەباسی مەحمووآغا» بووینەوە، وتیان: «هەباساغا» لە ڕاوە. زۆری پێ نەچوو نزیکەی دە پانزە زەلام لە گردەکەوە بەرەو بەرزایی بەر دیواخانەکە بوونەوە، هەموو بە پێیان هاتن. پیاوێکی چوار شانەی بەخۆوەبووی داڕێژراو، لەبەر بتەوی بە کورتەباڵا ئەهاتە بەرچاو، ڕانکوچۆخەیەکی عادەتی لە بەرا بوو شەکرەی جەمەدانەیەکی ڕیشووداری بە دەستووری پشدەر بە سەرەوە بوو، پشتێنێکی سێ چوار قەدی لە پشتا بوو، خەنجەرێکی پیا کردبوو، پێنج تیرێکی ئێرانی نابوو بە نەڕەی شانیەوە، ڕووبەڕووی ئێمە هات. چاك و چۆنی لەگەڵ کردین؛ زۆر سادە بوو وتی: با بچین بۆ دیواخان.

ئێمەش هەر چاوەڕێی هەباساغامان ئەکرد کە بێتەوە. تومەز ئەمە ئەم پیاوە هەباساغا بوو، کە پشدەری ئەودیو، لەبەر «هەباسی مەحمووآغا نوورەدین» پشتی ئەلەرزا. وا دیار بوو ئەم پیاوە بەلای ئێمەوە سادە بوو، ئەگینا لە ڕاستیدا وا نەبوو، دیواخان و دەسەڵاتی لە هەموو ئەو ناوەدا ناوی دەرکردبوو. بەیانی ماڵاواییمان لەو دەسەڵاتە و دیواخانە و لە نوورەدین کرد و بەڕێ کەوتین.

هەر لەو سەفەرەدا هاتینە «گاپێڵۆن» ئێوارەیەکی درەنگ بوو چووینە

مزگەوتەکە. دنیا زۆر سارد بوو، ئاگر لە بوخاری مزگەوتەکەدا کرابووەوە چووینە بەر ئاگرەکە. مزگەوتەکە پڕ بوو، هەرکەسە لە ئاشێ لێی ئەکرد. ئەوەندەمان زانی کتوپڕ کشوماتییەك هات بەسەر خەڵکەکەدا. ئێمە لە ئاشی خۆمان هەر نەکەوتین. من پرسیم: ئەوە بۆچ وا خەریکە بێدەنگ بوون؟ یەکێ وتی: ئەوە «حاجیەباساغا» هات؛ واتە «هەباسی سەلیماغا». ئەو جێگای تایبەتی خۆی هەبوو کە ئەهات بۆ مزگەوت لە سەفی یەکەما لە پشت ئیمامەوە دائەنیشت.

من هەندێ وشە لەو وڵاتی پشدەرە فێر بووبووم وەکوو: «چاپلووس، عەجەم، بێبڕوا و... هتد». ئەو سەردەمە زیتەڵە و قسەکانم زیاد لە ئەندازەی تەمەن و ڕێ و شوێنەکەم بوو. لە گوێ ئاگردانەکە قسەم ئەکرد و ئەمدا بەیەکا، ئەوەندەم زانی خەڵکەکە دڕنیان دا و پیاوێکی بەدیمەنی ڕیش تۆپی ماشوبرنج، کورتەك و شەرواڵێکی «ماوت»ــی زەردی عەجەمی لە بەرا بوو، پشتێنێکی چەندقەفی چیت، پێچێکی چیتی پشدەریانەی بەسەرەوە بوو، تەزبێحێکی بەدەستەوە بوو «سبحان الله»ی ئەکرد، هات لە تەنیشتمەوە دانیشت. تومەز ئەمە حاجیەباساغایە دەنگی قسەکانی من گوێی زرنگاندۆتەوە هاتووە بۆ هاڵوهەواڵ؛ منیش نازانم. دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵما وتی: ئێ! کاکە فەقێ دەنگوباسی عەجەمەکان چییە؟ منیش وتم: «چاپلووسن». ئەوەندەیتر تامازرۆ بوو بۆ قسە. ئەو بە نیازێك ئەیپرسی و منیش هەروا بە سادەیی وەڵامم ئەدایەوە. ئیتر نازانم هیچ کەڵکێکی لێم وەرگرت یان نە؟ ئەوەندە ئەزانم ئەو سەردەمە پشدەری ئەمدیو لەگەڵ عەجەمەکانا ڕێك نەبوون، ئیتر بانگی شێوان درا، قامەت کرا، وا بزانم حاجی شێخ موحسن ئیمام بوو، نوێژی شێوان کرا. حاجیەباساغا وتی: با بچینەوە بۆ دیواخان. کە چووینەوە دیواخان،

دامودەزگایەکی زۆر سەیرم هاتە بەرچاو، لە کتێبە ئەفسانەکانا باسی دیواخانی وردە پاشاکانم خوێندبووەوە، ئەو دیواخانە ئەفسانەی لێ کردم بە ڕاستی. ئەو شەوە لەوێ بووین و بەیانی ماڵاواییمان کرد و بەڕێ کەوتین.

هەر لەو سەفەرەدا هاتینە «سوورەقەڵات»ماڵی «ڕەشەی ئەوڵاغا». لە ئاغای «میراودەل»ی پۆشتە و پەرداخی وەکوو ڕەشەی ئەوڵاغام کەم دیبوو. هەر لە خۆی ئەهات ئەو کورتەك و شەرواڵی ماوتە، پشتێنێکی شاڵی عەجەم لە پشتا، خەنجەری دەستك ماهی بە کەمەرەوە، تەزبێحی کارەبا بە مشتوەکەیەوە، ئەم چیتە جوانە ڕیشووداره بە سەرەوە، قوندەرەی شبرەو لە پێیدا، لە دیواخانەکە لەسەر دۆشەك دانیشتبوو. پیاوان و خزمەتکاریش لەولاوە هەموو بە تفەنگەوە وەستابوون.

لەگەڵ هەندێ لە پیاوەکانیا قسەیان لە ڕەوە ئەسپەکەوە ئەکرد. تەمەنی ئەو سەردەمە لە دەوری سی ساڵێکا ئەبوو، خۆی زۆر بە شۆخوشەنگی ڕائەگرت. قسەی ئەوەیان لێوە ئەکرد کە کچە دۆمێکی تا ئەوپەڕ جوان و نازدار لە «کێلێ» هەیە دڵی لێچووە، ئەیەوێ مارەی بکا، بەڵام لەبەر بەگزادەی میراودەلی و لەبەر تانووتی خەڵك ناتوانێ پێی بە جەرگی خۆیا بنێ بۆ ئەو ئیشە.

«کاکەمین»ی براگەورەی ـ کە تەمەنی لە دەوری شەست ساڵا ئەبوو ـ ئەو بە پێچەوانەی ڕەشەی ئەوڵاغا ئەوەندە گوێی بە جلوبەرگ نەئەدا. هەموو کۆششی لەسەر ئەدەبیات و ئەشعاری شاعیران بوو. تا ئەو سەردەمە من کەم کەسم دیبوو کە وەکوو «کاکەمین» شارەزای غەزەلیاتی حافزی شیرازی بێ؛ بەڕاستی چاکی ئەزانی. ئێستەش شکڵەکەی لە بەرچاومە کە چۆن بە یەك چاوەوە شارەزای ئەو هەموو ئەدەبیاتە بوو. ئەو سەردەمە مەلا محەمەدی چرۆستانیش لەوێ مەلا بوو.

شەوێکیشمان لەوێ ڕابوارد و ڕووبەڕووی شاری سولەیمانی بووینەوە. گەلێ پاش نوێژی خەوتنان بوو بە «قەیوان» و «ئەزمڕ»دا سەرکەوتین. نمنمەی باران ئەباری. کە سەرکەوتین دیمەنی شاری سولەیمانی دەرکەوت، گڵۆپەی کارەبا لەناو شارا جریوەی ئەهات. یەکەم شتێکی جوانم چاوپێکەوتبێ تا ئەو سەردەمە دیمەنی ئەو شارە بوو لەو شەوە تاریکەدا کە ئەو گڵۆپانە جریوەیان ئەهات. ئێستەش هەر ئەو دیمەنە لە گۆشەی پەڕەکانی دڵما بە جوانی ماونەتەوە؛ چونکە لە ژیانما ئەوە سەرەتای دیمەنێکی جوان بوو لەو بابەتەوە کە من بیبینم.

ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە؛ لە ساڵێ (١٩٤٥)دا ئەو ڕەشەی ئەولاغایە کە من بەو شۆخوشەنگییە چاوم پێی کەوتبوو، لە بەغدا چاوم پێی کەوتەوە، زۆر شڕەبار بوو. ئەو جلوبەرگە جوانانە هەموو گۆڕابوونەوە بە ڕانکوچۆخەیەکی شڕ و جووتێ کەوشی دڕاو، جامەدانەیەکی چڵکن بە سەرەوە، بەڕاستی گریانم هات. جگە لەمە ئەو دامودەزگا و دیوەخانانە کە ئەو سەردەمە لە پشدەرا چاوم پێ‌کەوت، زەمان هاڕینی و خاوەن دیواخانیش بە دەربەدەری کەوتە گۆشەی شاران و گوندان. ئێستە نە خۆیان مان و نە ناونیشان و نە دیواخان. زەمان لەگەڵ کەسدا نییە، نابێ پشتی پێ ببەسترێ.

ساڵی (١٩٤٢) ڕۆژی شەشی مانگی «ئاغستۆز»ی ئەو ساڵەیە. دیارە ئەو ساڵانە من خەریکی کاروبار و نووسینی گۆڤاری گەلاوێژ بووم، کە لە بەغدا دەرئەچوو. شەڕە گەورەکەی جیهانی دووەمیش لە ساڵی (١٩٣٩) دا هەڵگیرسابوو؛ دنیا هەموو بووبوو بە ئاژاوە.

ئینگلیزەکان ئێستگەیەکی کوردییان بۆ پڕوپاگەندەی خۆیان لە «یافا» دانابوو. لە عێراقا عەبدوڵڵا گۆران، ڕەمزی قەزاز و ڕەفیق چالاکیان

ناردبوو بۆ یافا کە کاروباری ئەو ئێستگەیە هەڵسووڕێنن؛ بەڕاستی ئێستگەش لەو ڕۆژانەدا گڤەی ئەهات.

من لەبەر کاروباری گەلاوێژ لەو ڕۆژی شەشی مانگەدا چووم بۆ «مودیریەی دیعیایەی عاممە» کە ئەو سەردەمە ئەو مودیریەیەش هەر لە وەزارەتی داخلیە بوو. «محمد باشقە» لەوێ بوو؛ واتە لە مودیریە. پیاوانی محەمەد باشقەم لەو ڕۆژانەدا بەسەر گەلاوێژەوە لەبیر ناچێتەوە.

من کە لە پێپلیکانەکان سەرکەوتم، ئەوەندەم زانی لەولاوە «ئەدمۆنس» هاتە خوارەوە. «میستەر ئەدمۆنس» موستەشاری وەزارەتی داخلیە بوو لەلایەن ئینگلیزەوە، وە خۆیشی ئینگلیز بوو. هەر کە هاتە خوارەوە لووت و بزووت تووشی یەك بووین. ئەیناسیم، چاك و چۆنییەکی گەرمی لەگەڵ کردم و وتی: ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟ وتم: ئەچم بۆ لای محەمەد باشقە لە دیعایە. وتی: کەواتە منیش ئەگەڕێمەوە شوێنەکەی خۆم و ئەم چوونەم ناکەم. کە لەوێ دەرچوویت ئەبێ بێیت بۆ لای من، ئەمەوێ تۆزێ پێکەوە دانیشین و قاوەیەکیش ئەخۆینەوە. وتم: باشە، ئەگەر زوو لە ئیشەکەم بوومەوە دێم. ئەدمۆنسیش وەکوو من و تۆ کوردی ئەزانی، چ بە قسە کردن و چ بە نووسین.

هەردووکمان بە قالدرمەکەدا سەرکەوتین؛ ئەو بەلای چەپا گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی و من بەلای ڕاستا چووم بۆ دیعایە بۆ لای محەمەد باشقە. تۆزێ زیادم پێچوو، لەوێ ئەوەندەم زانی یەکێك کردی بە ژوورا و وتی: میستەرئەدمۆنس چاوەڕێت ئەکا. ئیتر هەستام و چووم بۆلای ئەو. ئەو کەسەش کە هات دیاربوو کە سکرتێرەکەی بوو.

هەر کە چوومە ژوورەوە ئەدمۆنس هەستا و هات بە پێشوازمەوە. زۆر بە گەرموگوڕی دەستی کرد بە قسە کردن و لە زەنگەکەی دا. کابرای

سکرتێر هاتە ژوورەوە ئەدمۆنس پێی وت: چا و قاوەمان بۆ بێنن و کەسیش ئیتر نەیەتە ژوورەوە. دووبەدوو ماینەوە. پاشان وتی: مامۆستا! ئەوا ئێمە لە یافا ئێستگەیەکمان بە زمانی کوردی بۆ ئێوە دانا. دیارە ئەم ئێستگەیە خزمەتێکی چاك ئەکا بە زمانی کوردی؛ بەتایبەتی ئەو کەسانەش کە لە سەرین ئێمە بڕوامان پێیانە کە خزمەتێکی باش ئەکەن بە زمانەکەتان. ماوەیەکە ئەمەوێ چاوم پێت بکەوێ، لەم ڕووەوە پرسیارێکت لێ بکەم، ئەوا ئێستە باش بوو ڕێکەوت. لەو کاتەدا دوو قاوەیان بۆ هێناین و پیاوەکە چووەوە دەرەوە.

وتم: فەرموو. وتی: پرسیارەکە ئەبێ بە دوو پرسیار. یەکەم: بیروباوەڕی کوردەکان چییە بەرانبەر بەم ئێستگەیە کە ئێمە دامانناوە؟ دووەم: بیروباوەڕی خۆت چییە لەم ڕووەوە؟

وتم: میستەر ئەدمۆنس بە لامەوە زۆر سەیرە ئەم پرسیارە کە تۆ لە منی ئەکەی؟ من چیم تا وەڵامی تۆ بدەمەوە؟

وتی: وا مەڵێ؛ تۆ گوڤارێکی وەکوو گەلاوێژت لە بەردەستایە. بە حوکمی ڕۆژنامەچێتی هەڵسوکەوت لەگەڵ هەموو جۆرە کەسێکا ئەکەی، بەتایبەتی خوێندەوارانی کورد. کەم کەس هەیە وەکوو خاوەن گۆڤار و ڕۆژنامە پەیوەندی لەگەڵ خەڵکا هەبێت.

وتم: میستەر ئەدمۆنس تکات لێ ئەکەم ئەم پرسیارە لە یەکێکی تری بکە. وتی: هەر لە تۆی ئەکەم، چونکە کەم کەس هەیە بە ئەندازەی تۆ لەگەڵ خەڵکا بێت. وتم: تکا ئەکەم وازم لێ بێنە. وتی: نابێ. وتم: میستەر ئەدمۆنس، خەڵکی چی؟ ئەم خەڵکە کە تۆ ئەیانبینی دوو بەشن: بەشێکیان هەر لە هیچ تێناگەن تەنها لە کاروباری تایبەتی خۆیان نەبێ، لە «ساحب» بەولاوە هیچی تر نازانن؛ بەشەکەی تریشیان کە دێنە لای

یەکێکی وەکوو جەنابت ئەڵێن: «ساحب» کە چوونە دەرەوە جنێوتان ئەدەنێ.

فڵانی هەرکە ئەوەم وت ڕەنگێکی هێناو بردی. ئەو ڕوومەتە گەش و سوورەی وەکوو لیموی زەرد هەڵگەڕاو هەتا بەینێك قسەی هەر پێ نەکرا. ڕاستی منیش لە قسەکانم تۆزێ پەشیمان بوومەوە، لە دڵی خۆما وتم چیم کرد بە خۆم.

پاشان هاتەوە قسە و وتی: باشە باوەڕی خۆتم پێ بڵێ: وتم: میستەر ئەدمۆنس تکات لێ ئەکەم لە خۆم گەڕێ. وتی: نابێ، هەر ئەبێ بیلێیت. بە تەواوی شپرزەی کردم. وتم: میستەر ئەدمۆنس ڕاستی باوەڕی من ئەوەیە: تا ئیشتان هەیە ئەم ئێستگەیە ئیش ئەکا، کە ئیشتان نەما ئێستگەکەش نامێنێ. وتی: مامۆستا چۆن شتی وا ئەبێ؟ وتم: وەڵڵا ئەمە باوەڕی منە و تۆیش زۆرم لێ ئەکەی بۆ قسە کردن. بەڵام ئەوا هەستیش ئەکەم کە گەرموگوڕییەکەی نەماوە و لە دڵا زۆر پڕە.

زەمان هێنای و بردی، لە مایسی (١٩٤٥)دا شەڕ دوایی هات. دوای ئەوە ئێستگەی کوردی یافا کەوتە کز بوون. زۆری پێ نەچوو گۆران هاتەوە، پاش بەینێکی‌تر ڕەمزی قەزازیش هاتەوە. دواچۆڕ ڕەفیق چالاك گەڕایەوە و ئێستگە بە تەواوی سەری تیاچوو.

عەبدوڵڵابەگ کە هەر هاتەوە کەوتە دەردەدڵ کردن کە چۆن هەر لەگەڵ دوایی هاتنی شەڕیان بڵاو کردەوە ئیتر لەگەڵ ئەوانیشا کەوتنە لووتوپووت.

ڕێکەوت زۆر سەیرە! لە پاش چەند ساڵ و لە پاش دوایی هاتنی جەنگ و لە پاش نەمانی ئێستگەی کوردی یافا، ڕۆژێکی‌تر هەر لە داخلیەوە هەر لە هەمان شوێنی سەر قاڵدرمەدا تووشی ئەدمۆنس بوومەوە.

من دەست پێشکەریم کرد، لە پاش چاك و چۆنی دەستم بۆ ڕیشە بێ ڕیشەکەم برد و وتم: «ها میستەر ئەدمۆنس چیمان وت؟» وتی: «ئێ، بێ قەزابی مامۆستا، ئەمە سیاسەتە». منیش وتم: بەڵێ ئاخر، منیش ئەموت سیاسەتە. ئیتر لە یەك جیا بووینەوە، ئەو سەرەوخوار و من سەرەوژوور بووینەوە.

**٢٣٣.**ساڵی (١٩٣٤) ڕابواردنی سولەیمانی جۆرێکی‌تر بوو. حەمدی ئەفەنی چایچی ـ خاوەنی قەوانی ئای ئای ـ بڕیاری دا پەردەپڵاوێك لە ماڵەوە دروست بکا و بۆ نیوەڕۆژەی ئەو ڕۆژە ـ کە ڕۆژی سێشەنبە بوو ـ بیهێنێتە مزگەوتی حاجی مەلاڕەسووڵ بۆ ئەو دەستە دۆست و برادەرانەی کە بانگی کردبوون، بیخۆن. دەستەکەش بریتی بوون لە: مەلا مستەفای حاجی مەلاڕەسووڵ، وەستا ئەورەحمانی کەبابچی، وەستا ئەحمەدی حاجی سەیفوڵڵا، خالدەفەنی، دەروێش ئەحمەدی چایچی، حاجی مەلا عارفی بستۆ، وەستا ساڵحی چایچی، حاجی عەزیزی تووتنچی، مەلا حەسەنی شاتری، دیارە منیش بەشوێنیانەوە.

نوێژی نیوەڕۆ کرا. حەمدیەفەنی ماڵەکەیان نزیك بوو لە مزگەوتەکەوە، دوو سێ جار هاتوچۆی ماڵەوەی کرد و هەر جار کە ئەهاتەوە ڕەنگی زیاتر تێك ئەچوو. حەمدیەفەنی خۆی لە خۆیا تووڕە بوو، لەو هاتوچووەشدا ئەوەندەی‌تر ئاگری گرتبوو. لە ئێمە وایە پەردەپڵاوەکە ڕێك نەکەوتووە و لە شەرمەزاریدا تووڕە بووە. ئێمە هەموو هەستمان پێ‌کرد. مامۆستا مەلا مستەفا هاتە قسە و وتی:

حەمدیەفەنی! هیچ تووڕەیی و شەرمەزاری ناوێ، ئێمە هەموو براین و خێزانی ماڵێکین، خۆ غەریب نیت. دوور نییە لە ماڵەوە ئیشیان

هەبووبێ، بۆیان ڕێك نەكەوتبێ نان دروست كەن، ئێستە ئەنێرینە بازاڕ لە كەبابە نایابەكەی وەستا ئەوڕەحمانمان بۆ دێنن و نان ئەخۆین. ئیتر بۆچی خۆت سەغڵەت ئەكەی؟

حەمدیەفەنی ئیتر خۆی نەگرت. وتی: مەلا مستەفا ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ نانی چی و شتی چی؟ من ئەوا ساڵ و عەیام و زەمانە ئیمڕۆ هەوەسم هەستاوە لەو قەحبەبابەی ژنم، هەر كە ئەچمەوە بە پەلە سەیر ئەكەم سێ چوار دێڵەقوڕ لە ژوورەكەدان. ئەیبەمە ژوورێكی‌تر ئەو خراپتر. ماڵەكەمان ئیمڕۆ بووە بە نێرگەلەكەی سەی‌ئەحمەدی بابەڕەسووڵەوە. نازانم ئەم هەموو ژنە چییە ئیمڕۆ ڕوویان كردۆتە ماڵی ئێمە؟ منیش بەخێر ئەبێ بۆ خۆم سەبر بكەم تا ساڵێكی‌تر ئەم وەختە!.

لە پاشا پەردەپڵاویان هێنا، بەڵام چ پەردە پڵاوێك؟ پەردەپڵاوێكی شیرداخی، بە ڕۆنی زەنگ و برنجی بسكان و دەست و پەنجەی ئەجەخان لێ نرابێ، ئەبێ چ پەردەپڵاوێك بووبێ؟ ئای حەو جار سڵاو لە ڕۆنە زەنگەكەی ئەو ڕۆژە.

ئەم باسە تا (١٩٣٩) قسەت بۆ ئەكەم چونكە لەو مێژووەدا ئیتر من ئاگام لێ بڕا و كەوتمە بەغدا.

٢٣٤. ڕابیعەخان هەبوو لە سولەیمانی ماڵیان لە گەڕەكی ئەسحابەسپی بوو. نانەوا بوو لە بازاڕ. كە ئەڵێم نانەوا بوو نەوەك وەكوو ئەو ژنانە كە لە ماڵانا نانەواییان ئەكرد، بەڵكوو نانەوا بوو وەكوو پیاوان. نانەواخانەكەی لە خوار دووكانەكەی مەلا عەلی سەحاف و بە تەنیشت دووكانەكەی حەمەی شازەمانەوە بوو لە بازاڕی ماستفرۆشەكان.

كولێرە بازاڕ ئەو سەردەمە هەر دوو كولێرەی بە سێ پوول بوو. ئەگەر

یەکێ کولێرەیەکی بویستایە بە دوو پوول بوو.

ئەم ڕابیعەخانە ـکە بە ڕابیعە سنەیی بەناوبانگ بوو ـ شێرەژنێك بوو لە ژنانی سولەیمانی. بەیانی لە ماڵ دەرئەچوو، کراس و کەوایەکی ژنانەی درێژی لەبەرا بوو، لەسەر کراسەکەوە پشتێنی هەبوو، مشکییەکی ئەکرد بە چارۆکە و ئەیدا بە ناوشانیا، سەروپێچێکی ژنانەی سولەیمانییانەی ئەبەستەوە. جگەرەیەکی قامیشی ئەنا بە لالێوەیەوە و بەو جۆرە ئەچوو بۆ دووکان. کە ئەچوو دۆشەکێکی بچووکیان بۆ دانابوو، هەویرکەر و نانەوا هەموو شتێکیان حازر کردووە، ئەوانەش هەموو پیاو بوون، ئەم ئیشی خۆی هەر ئەوەبوو پارەی وەرئەگرت.

بەم جۆرە تا ئێوارە ئەمایەوە. پاش عەسر کە نان تەواو ئەبوو دائەنیشت لەگەڵ پیاوە بەردەستەکانا حسابی ئەکرد و باری بەیانی پێ ئەوتن و ئەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. موعامەلەی هەبوو لەگەڵ ئەهلی دەرەوەدا؛ گەنمی لێ ئەکڕین و ئەیکردە عەمارەوە. ئەو پیاو و نانەوا و بەردەستانە بڵێم نازانم وەکوو چی لێی ئەترسان؛ هەموویشی بە ڕۆژانە ڕایگرتبوون.

لە گەڕانەکانیا عەبا و شتی بە سەرەوە نەبوو. مەبەست لەمە ئەوەیە ژنێکی وا سەربەستی بەبێ عەبا و پەچە لەناو شاری سولەیمانیدا و ئیشی پیاوان بکا ئەمە نەبوو. تازە کچانی قوتابخانە پەیدا بووبوون، ئەوانیش ئەبوایە بە پەچە و عەباوە بوونایە، ژنێك ئیشی پیاوان بکا ئەمە هەر نەبوو.

٢٣٥. هەتا ساڵی (١٩٤٨) هەندێ ئیش و کار هەبوو ئەمانە هەر تایبەت بوون بە جوولەکەوە؛ وەکوو خومخانەگەری، زێڕینگەری. موسوڵمانەکان نەئەبوا ئەم جۆرە ئیشانەیان بکردایە؛ چونکە زۆر زۆر شوورەیی بوو. لە وڵاتی ئەردەڵانا تەنانەت بازرگانی، (واتە چیت و کووتاڵ

فرۆشتن) پارە گۆڕینەوە (واتە «صَرْف»ی) هەر ئەبوا جوولەکە بیکردایە. دوکتۆری و حەکیمی بۆ موسوڵمانەکان عەیب بوو. بۆ ئاغەوات و بەگزادەی دەرەوەی شارەکان «فەرمانبەری» (مُوظَّف) ئەگەر بیانکردایە حەیایان لە هەموو عالەما ئەچوو.

لە گوندەکاناماڵە جوولەکە هەبوو. ئەم جوولەکانە ئیشی گرانی لادێیان نەئەکرد، چەند پریاسکەیەکی داودەرمان و دەرزی و دەزوو و خەنە و وسمە ـکە هەموو تاباری کەرێك نەئەبوو ـ سەرمایەی ژیانیان بوون. لە ئاغە و مسکێنی گوندەکە باشتر و پوختەتر ڕایانئەبوارد.

٢٣٦. شێخ مارفی سەلمەخان کە بە شێخ مارفی «قازانقایە» بەناوبانگ بوو، پیاوێکی هەتا بڵێیت نان بدە و دڵ فراوان بوو. جۆری ڕابواردنی ژیانی لە شاهانە ئەچوو. یەکێ لە جۆری ژیانەکەی ئەوەبوو زۆر حەزی لە ڕاوە بەراز ئەکرد. لەبەر ئەوە بە دایمی سی چل سەگی بەچەشەی ڕاوی هەبوو، کە لەبەر خزمەتکردنی ئەم سەگانە چەند ماڵی بە خێزانەوە بەخێو ئەکرد.

ڕۆژێك لەگەڵ دەستەیەك لە خزمەکانی و لە خزمەتکارەکانی ئەچێ بۆ ڕاو. ڕوو ئەکەنە ئەو بناری «تەنگیسەر»ە، لەناو پارچە مەرەزەیەکا «مالۆس»ێك هەڵئەستێنن. لەلایەکەوە تفەنگچی و لەلایەکەوە گەلەسەگ دەوری مالۆس ئەدەن.

لەناو مەرەزەکەدا دارێکی بچکۆلەی تێدا ئەبێ، «گۆخڵ»ەکە لەبن دارەکەدا ئەبێ. مالۆس ڕوو ئەکاتە دارەکە. کابرای گۆخڵ لە ترسا بە دارەکەدا هەڵئەزنێ و بە هەرجۆر بێ خۆی پێوە ڕاگیر ئەکا. دارەکەش ئەوەندە بێ‌تینە لەوانەیە کابراکە ببزوێتەوە، دارەکە بشکێت، بۆ نەگبەتی ئەو

مالۆسەش دێت لە بن دارەکەدا ماتە ئەکا.

کە مالۆس ئەچێتە ئەوێ شێخ مارف لەولاوە بانگ ئەکا ئەڵێ: «هۆ کابرا! بە مەرقەدی شێخ سمایلی ولیانی بکۆکی، وەیا ببزویتەوە تفەنگێکت پێوە ئەنێم و ئەتکوژم! هیچ مەکە تا چارێکی ئەم مالۆسە ئەکەین».

کابرا بە جارێ هەناوی دائەکەوێ: ئەگەر ئەبزوێتەوە لەولاوە بە تفەنگ ئەیکوژن؛ ئەگەر نابزوێتەوە لەملاوە بەرازەکە سەیری ئەکا و ئەیەوێ بە شفرە دارەکە لە بن بێنێ.

بە هەرجۆر بوو بەراز لە بن دارەکە ئەڕەتێنن و لە دواییدا ئەیکوژن. ئەمجا شێخ مارف کابرا بانگ ئەکا و لێی ئەپرسێ: ڕاستم پێ بڵێ، بەڵام ڕاست، هیچ درۆ مەکە. بە مەرقەدی شێخ سمایلی ولیانی ئەگەر ڕاست قسە بکەی چیت بوێ ئەتدەمێ. لەو وەختەی کە من بەو جۆرە بانگم کردی چیت وت؟ ئەویش ئەڵێ: «وەڵڵا یا شێخ ئەوی ڕاستی بێ وتم: خوایە تۆ منت خستە بەینی دوو بەرازەوە: ئەگەر ئەبزوومەوە ئەو بەرازە ئەمکوژێ؛ ئەگەر نابزوومەوە ئەم بەراز ئەمخوا. جا خوایە کەیفی خۆتە؛ ئێستە تۆیش ئەمکوژی و نامکوژی کەیفی خۆتە؟»

ئەڵێ: شێخ مارف قاقا دەست ئەکا بە پێکەنین. جارێ هەر لەو شوێنەدا چی لە بەرا ئەبێ بە کەوا و سەڵتە و پاڵتۆ و چەفتە و پشتێنەوە بۆی دائەکەنێ و ئەیداتێ، کە ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە دووسەد قڕانی تریشی خەڵات ئەکا.

٢٣٧. کارەساتی دەوران زۆر سەیرە، بۆیە قسە، قسەی لێ ئەبێتەوە. «خلەپەزە»ی هەمەوەن پیاوێکی دیار و بەدیمەنی هەموو وڵاتێك بوو؛ لەو سەردەمەدا لە «مەیدان» و «هۆرێن شێخان» دائەنیشت.

دنیای تەماع بەینی ئەو و حەمەپاشای جافی تێك دابوو.

ڕۆژێك خلەپەزە لە بەینی کوڕەکوڕەی هەمەوەنا دائەنیشێ و ئەڵێ: ئەبێ ئەو حەمەپاشای جافە بگرم و بی‌هێنم سەری ببڕم، ئەو سەرو کەللەیە بە ڕیشە زلەکەیەوە هەڵواسم بە ژێر سکی ماینەکەما.

ئەم قسەی خلەپەزەیە [هەوار بە] هەوار ئەپەڕێ تا ئەگاتە کوێستانی «بس» و «مەولاناوا» لە وڵاتی «بانە[!]» کە شوێن هەواری حەمەپاشا ئەبێ. قسەکە ئەگاتەوە بە حەمەپاشا، حەمەپاشاش ئەڵێ: هەروەها ئادەی جاف بە چوارسەد سواری جافەوە ئاوزەنگی‌تەقێن، هەواری ئەو ساڵەی مەولاناوا لەخۆی حەرام ئەکا و دێت بۆ وڵاتی «مەیدان». لە بەرەبەیانی شەوێکی تاریکا ئەدا بەسەر بەرەی خلەپەزەدا. چارەنووس لە چارەی خلەپەزەی ناوداری هەمەوەندی نووسیبوو کە بکەوێتە دەست حەمەپاشای جاف.

حەمەپاشا ئەیگرێ و سەری ئەبڕێ. جارێ لەشەکەی دێنێ هەڵێئەدڕێ و پڕی ئەکا لە باڕووت و پێکیەوە ئەنووسێنێتەوە و ئاگری پێوە ئەنێ، باڕووت ئەتەقێتەوە، هەر پرزۆڵە گوشتێکی ئەبا بە لایەکدا. سەرەکەشی دێنێ هەڵێئاوسێ بە ژێر سکی ئەسپەکەیا و بەو جۆرە بەرەو دوا ئەگەڕێتەوە بۆ هەوارگەی کوێستانی مەولاناوا ئەڵێ: «خلەپەزە ئاوا سەری من هەڵاوەسی بە ژێر سکی ماینەکەتا؟!».

**.٢٣٨** لە (١٩٠٨)دا خۆت ئەیزانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ئاخر و ئۆخری پیریدا بوو. ئەو ڕۆژەی سوڵتان عەبدولحەمید وای ئەویست کە شێخ سەعیدی کوڕی سەیدمحەمەدی کوڕی کاکەحەمەد لە وڵاتی سولەیمانی بنێرێ بۆ ئەستەموڵ؛ بەڵام دەستەی بەرەی کاکەحەمەد زۆر بوون، حکوومەتی ئەو ڕۆژە هەروا بەو سانایییە پێی نەئەکرا شێخ

سەعید بنێرێ بۆ ئەستەموڵ.

ڕێکەوتیش وا بوو هەر لەو سەردەمانەدا حکوومەتی سولەیمانی ـ کە عەبدولحەمید بوو ـ ناردبووی بەشوێن مەحمووپاشای کوڕی حەمەپاشای جافدا. مەحمووپاشا بە نزیکەی سێسەد سوارەوە دێت بۆ سولەیمانی. ئەم هاتنەی ئەم بەم سوارانەوە وای بردبووە دڵی خەڵکەوە کە گوایە بۆ ئەوە هاتووە یارمەتی حکوومەت بدا بۆ ناردنی شێخ سەعید بۆ ئەستەموڵ. لەگەڵ ئەوەشا وا نەبوو.

حکوومەت شێخ سەعیدی نارد و شێخ سەعید لە مووسڵ کوژرا و دەنگ وا بڵاو بووەوە کە حکوومەت دەستی لە کوژرانی شێخ سەعیدا هەیە.

شێخ مەحموودی کوڕی شێخ سەعید ـ کە لەگەڵ باوکیا ئەبێ ـ لە مووسڵ لە پاش کوژرانی باوکی، خۆی ئەگەیەنێتەوە وڵاتی سولەیمانی. وەکوو شێری برسی لێ دێ بۆ تۆڵە سەندنەوەی باوکی؛ چ لە حکوومەت، چ لەو کەسانە کە بوون بەهۆی کوژرانی باوکی، لە شاری سولەیمانی و وڵاتی سولەیمانیدا. دەستەیەکی زۆری بۆ ئەم ئامانجە پێکەوە ناوە.

دیسان لەم وەختەشا حوکوومەت ئەنێرێتەوە بەشوێن مەحمووپاشای جافا کە بێت بۆ سولەیمانی. مەحمووپاشا بە شەشسەد حەوسەد سواری جافەوە دێت بۆ سولەیمانی. کوڕەکوڕەی جاف کە ئەزانن مەحمووپاشا بۆ سولەیمانی ئەچێ و لەو سەردەمانەشا لووتوپووتی حکوومەت لەگەڵ مەحمووپاشادا تۆزێ باش نییە و لەلایەکیتریشەوە شێخ مەحموودیش لەوێیە و شێخ مەحموودیش بە قسەی خەڵك وا چووەتە دڵیەوە کە جاری پێشوو ئەگەر مەحمووپاشا نەهاتایە بۆ سولەیمانی، شێخ سەعیدی باوکی نەئەنێررا بۆ ئەستەموڵ و لە مووسڵ بکوژرێ، لەبەر ئەمە لە کوشتنی شێخ سەعیدا مەحمووپاشا هاوبەشە؛ کەواتە ئەبێ تۆڵەی لێ بکاتەوە.

ئەم دوو دەنگوباسە لەناو شۆڕەسواری دەستەی مەحمووپاشادا بڵاو بووەوە. ئەم دەستەیە هەتا لە سولەیمانی نزیکتر ئەبوونەوە ژمارەیان کەمتر ئەبووەوە. لە هەر قۆناغێکا بەشێکیان خۆیان ئەدزیەوە، تا گەیشتنە ناو شاری سولەیمانی لە شەشسەد حەوسەد شۆڕەسواری جاف، مایەوە «شەست» کەس. ئەوانەش لە پشتماڵەی مەحمووپاشا خۆی بوون.

مەحمووپاشا بەم شەست سوارەوە دێتە ناو شاری سولەیمانی و ئەچێتە ماڵی «ئەوڕەحماناغا». لە پاش حەسانەوە، بەخۆی و بە پیاوەکانیەوە ئەچێ بۆ «سەرا» کە ئەو سەردەمە لە شوێنی دەبووەکە بوو.

لەولاوە شێخ مەحموو کە ئەبیەت وا مەحمووپاشا هاتووەتە سولەیمانی و مەحمووپاشاش گۆیا دەستی لە کوشتنی شێخ سەعیدا هەبووە، بە خۆی و بە لەشکرێکی کۆکەوە ڕوو ئەکاتە ناو شار بۆ کوشتنی مەحمووپاشا. لەو وەختەدا کە مەحمووپاشا ئەچێ بۆ سەرا، دیارە ئەزانن چۆن کارەساتێك ئەبێ، پیاوەکانی خۆی هەموو فیشەك ئەخەنە بەر تفەنگ و تفەنگ ئەگرن بە دەستەوە و دەست ئەخەنە سەر تێسکە. مەحمووپاشا ئەخەنە ناوەڕاستی خۆیان و بەو جۆرە پۆلیس کە مەحمووخدری کوڕی خلەپەزە ئەبێ، پیاوەکانیشی هەموو لە دەرەوە ڕائەوەستن، مەحمووپاشا و مەحمووخدر پێکەوە دووبەدوو لە ژوورێکا ئەمێننەوە.

لەولاوە شێخ مەحموو کە ئەبیەت وا مەحمووپاشا چووەتە سەراوە، ئەکەوێتە سەر ئەوە کە پەلاماری سەرا بدا و سەرا بگرێت. بە هەڵەداوان ئەم خەبەرە دێنن بۆ مەحمووخدری مودیری پۆلیس. مەحمووخدر لایەنی مەعمووریەتی لەبیر ئەچێتەوە و دەماری عەشرەتی ئەیبزوێنێ، ئەڵێ: «عەشرەت پشتی عەشرەت نادا بە زەویدا ئادەی پۆلیس». فەرمان ئەکاتە سەر پۆلیس کە بچن سەر سەراکە بگرن، مەفرەزەی پۆلیس بە

تفەنگەوە هەموو کەلێن و قوژبنی سەر بانی سەرا ئەگرن و پیاوەکانی مەحمووپاشاش دەوروبەری دەرکی سەراکە ئەتەنن و سەرا قایم ئەبێت.

لەم وەختەدا ڕیش‌سپیانی سولەیمانی بە «قورعان»ـێکەوە ئەچن سەری ڕێ بە شێخ‌مەحموو ئەگرن و ئەڵێن: بیکە بە خاتری ئەم قورعانە بگەڕێوە. سەرا قایم کراوە و لە هیچوپووچ ئەبێ [بۆ] خوێن لەش بیا؟. مەبە بەهۆی ڕژانی خوێنی بێ‌گوناحان و با سولەیمانی تێك نەچێ. شێخ مەحموو کە بە قورعانەوە ئەچن بە پیریەوە، لەبەر «قورعان»ـەکە ئەگەڕێتەوە و واز لە فیکرەکەی خۆی دێنێ.

لەملاوە ـ کە قسە لێرەدایە ـ لە جۆشی ئەو شڵەژانەدا کەوا مەحمووپاشا و مەحموودخدر پێکەوە دووبەدوو لە ژوورەکەدا دانیشتوون، مەحموودخدر ڕوو ئەکاتە مەحمووپاشا و پێی ئەڵێ: «ئەرێ مەحمووپاشا ئەو وەختە کە حەمەپاشای باوکتیان کوشت عومرت چەند بوو؟». (مەبەستی ئەوە بووە کە بەم قسەیە ئەیەوێ تانووتێك لە مەحمووپاشا بدا و دڵی بریندار بکا!). مەحمووپاشاش ئەڵێ: جەنابی مەحموودخدر لەو وەختەدا کە حەمەپاشای باوکم کوژرا عومرم ٣٢ ساڵ بوو؛ بەڵام لەو وەختەدا کە هەر حەمەپاشای باوکم خلەپەزەی باوکتی کوشت عومرم بیست ساڵ بوو.

مەحموودخدر ئیتر نایەتە زمان و پاش گەڕانەوەی لەشکری شێخ کە ناوشار تۆزێ ئارام ئەبێتەوە، مەحمووپاشا هەڵئەستێ و دێتەوە بۆ ماڵی ئەورەحماناغا.

**٢٣٩.** «تامووراغا» هەبوو پیاوێکی دەوڵەمەندی بەدەستەڵات و خاوەنی مەڕ و شوانکارە بوو. لە هەولێر دائەنیشت، تووشی نەخۆشییەکی گران بووبوو. گەلێ وڵاتان گەڕابوو، دوکتۆرەکان هەر ئەوەیان

بۆ دەرکەوتبوو کە ئەمە ڕیخۆڵەی پێچی خواردووە. لەبەر ئەوەش کە عومری سەرکەوتووە تاقەتی ئەوەی نەماوە کە «عەمەلیات» بکرێ. دوکتۆری مووسڵ و بەغدا و شام هەر لەسەر ئەمە بوون؛ بەڵکوو هی لەندەنیش، لەبەر ئەمە تامووراغا ڕۆژبەڕۆژ هەر لە کوتی ئەدا و هەر بەرەو پیری مردن ئەچوو، ئیتر دەستیان لێ شت و چاوەڕێی ئەوەیان ئەکرد ها ئێستە، ها سەعاتێکیتر بمرێ.

ئەم لەم حاڵەدا بوو، شوانکارەی هەبوو. ڕۆژێك یەکێ لەو شوانکارانە ـکە ناوی مستۆ بووـ هاتبوو ڕۆنی هێنابوو، سەیری کرد ماڵی تامووراغا لە شین و شەپۆڕدان. ئەپرسێ: ئەمە چییە؟ ئەڵێن: تامووراغا لە حاڵی خۆیایەتی و هەموو دوکتۆرەکان وتوویانە ڕیخۆڵەی پێچی خواردووە و لەبەر عومر گەورەییشی ناتوانن دەستی لێدەن. ئەڵێ: ئا بمبەن حەز ئەکەم منیش چاوم پێ بکەوێ. ئەیبەن، ئەویش سەیری ئەکا. لە پاش ئەوە دەست ئەنێ بە سکی تامووراغادا ئەڵێ: بەڵێ، ڕاستە ڕیخۆڵەی پێچی خواردووە، بەڵام من ئێستە چاکی ئەکەمەوە، بە مەرجێك هەر شتێك ئەڵێم بۆم بێنن و قسەش نەکەن. ئەڵێن: باشە. ئەڵێ: سێ هەڵماتی شووشە و قووتوێك ڕۆنی زەیتەم بۆ بێنن، وە هەر ئێستەش گونکێکی هەویر لەسەر ساج بکەن بە کولێرەیەکی گەرم و بۆم حازر کەن. هەڵماتەکان و قووتوە ڕۆن زەیتەکەی بۆ دێنن. تامووراغاش هیچ هێزی نەماوە و تەنانەت قسەشی نەماوە.

کابرا دەمی تامووراغا ئەکاتەوە، یەکەیەکە هەڵماتەکان ئەخاتە گەرووی. بە پەنجە ئەیخاتە خوارەوە ڕۆن زەیتەکەی ئەکا بەشوێنیا. کەسوکاری تامووراغا ئەیانەوێ دەستی بگرن، ئەڵێن: ئەو لەو حاڵەدایە تۆ بە تەواوی خنکاندت. ئەڵێ: من نەموت نابێ قسە بکەن. هەندێکیتر لە

کەسوکارەکەی ئەڵێن: خۆ ئەو مردووە واز لەم پیاوە شوانە بێنن ئەگەر چاك بووەوە ئەوا چاك بووەتەوە؛ ئەگینا خۆ ئەو هەر مردووە.

کابرای شوانە هەرکە هەڵمات و ڕۆن زەیتەکە ئاوا لێ ئەکا ئەڵێ خێرا کولێرە گەرمەکەشم بۆ بێنن. کولێرەی سەر ساجی بۆ لائەبەن و بۆی دێنن. کولێرەی گەرمی سوور ئەنێتە سەر سکی تاموراغا و بەسەر سکیا ئەیگێڕێ؛ ئەوەندەی ئەگێڕێ تا کولێرە وردە وردە سارد ئەبێتەوە. ئەویش هەر بە دەستی پیا دێنێ. سەیر ئەکەن تاموراغا چاو ئەکاتەوە زۆری پێ ناچی کەمەکەمە زمانی گۆ ئەکا و ئەڵێ: بمبەنە سەر ئاودەست. کوڕ و خزم و کەسوکار لە خۆشییا وەختە پەڕ دەرکەن. هەڵیئەگرن و ئەیبەنە سەر ئاودەست. شوانەکەش لەگەڵی ئەچێ. تاموراغا دائەنیشێ و پاش هەڵسانی، شوانەکە لەناو پیسایییەکەی هەڵماتەکان هەڵئەگرێتەوە. وا خزمەکانیشی هەموو چاویان لێیە، تاموراغا ئەمجا بەپێی خۆی ئەگەڕێتەوە بۆ سەرجێگای خۆی.

لە پاش تۆزێ داوای نان ئەکا ئەڵێ: برسیمە. شوانە ئەڵێ: شۆربایەکی تەڕی بۆ بکەن، شۆربای ئەدەنێ ئەیخوا، دیسان داوا ئەکاتەوە، شوانە ئەڵێ شۆربای بدەنێ. لەو ماوەیەدا جارێکی‌کەش ئەچێتە سەر ئاودەست. شوانە دوو ڕۆژ لەوێ ئەمێنێتەوە تا تاموراغا بە تەواوی ئەکەوێتە خواردن و ئەڵێ: هەموو شتێکی ئیتر بدەنێ. لە ڕاستیدا تامواغا بە تەواوی ساغ ئەبێتەوە و هیچ عەلەمی تیا نامێنێ.

ئەمجا لە کابرای شوانە ئەپرسن: ئەمە چییە و تۆ چۆنی تێ ئەگەی؟ ئەڵێ: من وای ئەزانم ئەمە ڕیخۆڵەی پێچی خواردووە، ئەبێ شتێکی سافی قوورس هەبێ بەو شوێنەدا و بەناو ڕیخۆڵەکەدا بڕوا، بۆ ئەوە پاڵ بە شوێنە پێچ خواردووەکەوە بنێ، ئەو شتەش بە عەقڵی من هەر ئەبێ

هەڵماتی شووشە بێ؛ چونکە هەر ئەوە ساف و قورسە. ڕۆن زەیتەکەش بۆ ئەوەیە لەگەڵ هەڵماتەکەدا بڕوا و ناو ڕیخۆڵەکە «لووس»ـتر بکا و ڕێگا بکاتەوە بۆ ڕۆیشتنی هەڵماتەکە. کولێرە گەرمەکەش بۆ ئەوەیە کە گەرمایی بگا بە ڕۆن زەیتەکە نەوەستێ؛ چونکە ڕۆن زەیت بە گەرمایی زیاتر ئەکەوێتە جووڵە. ئەمانە هەریەکە ئیشی خۆیان کرد، هەتا لەولاوە ئەوە بوو هەڵماتەکان دەرچوونەوە پێچی ڕیخۆڵەکە ڕاست بووەوە هاتە سەر دۆخی خۆی.

تامووراغا ئەوا چاك بووەوە. ئەمجا ڕووی کردە مستۆی شوانکارە وتی: هەرچی خێروبێری ئەمساڵی ئەو مێگەلە مەڕەی من هەیە، سا هەزار سەرە یان کەمترە، هەموو بۆ تۆ!. جگە لەمە دیسان خەلاتێکی‌تریان کرد و گەڕایەوە بۆ لای مەڕ و مێگەلی خۆی.

٢٤٠. لە فێڵی دەرۆزە: ساڵی (١٩٢٩) بوو ڕێم کەوتە شاری «بانە». دنیا پاش عەسر و دەمەدەمی ئێوارە بوو. لە گۆڕەپانی «زیندروو»ەکانا خەڵکێکی زۆر ڕاوەستابوون بە دەورە. زۆریی خەڵکەکە سەرنجی ڕاکێشام، چووم. کە چووم سەیر ئەکەم لە ناوەڕاستی خەڵکەکەدا دەروێشێکی کەلهوڕ چارۆکەیەکی سپی ڕاخستووە، سندووقێکی بە ئەندازەی هەزارپیشەی لە تەنیشتەوە داناوە، خۆیشی ڕاوەستاوە. سەری سندووقەکە دادراوەتەوە، دەست بۆ سندووقەکە ڕائەکیشێ و بە زمانێکی پاراو کە گرێ نایەتە بەری ئەڵێ: «خەڵکینە! ئەزانن ئەم سندووقە چی تێدایە؟ ئەم سندووقە ئەژدەهایەکی تێدایە شاخی دەرکردووە، تووکی بەسەر زەویدا ئەکشێ، چاوەکانی بریسکەیان دێ، لەشی لە هەزار ڕەنگ ئەدرەوشێتەوە، گوڵێکی «پیرۆ»یی لە ئاسمان شینتر، گوڵێکی سەوزە لە قەرسیلی بەهار

سەوزتر، گوڵێکی سوورە لە گوڵەباخی پادشاهان سوورتر، گوڵێکی زەردە لە کارەبای یەمانی زەردتر. ئەوی نەیبینێ لە دنیادا هیچی نەدیوە، ئەوی ببینێ هەموو دنیای دیوە. ناوبانگی ئەم مارە کە ئەژدەهایە گەیشتۆتە چین و ژاپۆن، گەیشتۆتە وڵاتی ئەڵمان و فەرەنگستان. پارە داخەنە سەر ئەم چارۆکەیە، چاوتان بکەوێ بەم مۆجزەیە».

خەڵکیش هەر زیاد ئەکا و دەقیقە بە دەقیقە تامەزرۆی ئەوەن کە چاویان پێ بکەوێ، وەکوو بارانی بەهار پارە ئەبارێ بەسەر چارۆکەدا ئەویش هەرجارە بە قسەکانی زیاتر هانی خەڵکەکە ئەدا بۆ ئەم چاوپێکەوتنە. جارجاریش سەیرێکی پارەی ناو چارۆکە ئەکا، ئەڵێ: هێشتا ماویە بگا بە قیمەتی چاوپێکەوتنی ئەو ئەژدەهایە. ئەو عالەمەش هەر وەختە ڕۆحیان دەرچێ. هەتا دێت هەر خەڵکی تریشیان پێوە ئەنووسی؛ چونکە لە ماوەی ئەو سەعاتەدا لە هەموو شارەکەدا دەنگی دایەوە کە شتێکی وا هاتووە، بەرەبەرە ئەهاتن بۆ چاوپێکەوتنی.

کابرای دەروێش ئەمجا کەوتە ژماردنی پارە و ئەیوت: ئەوەندە تمەن، وەیا ئەوەندە قرانی ماوە بگا بەو ئەندازەیە کە من ئەیڵێم. خەڵکەکەش ئەوەندە بە تاسە بوون هی وا هەبوو دوو جار و سێ جار پارەی فڕێ ئەدا بۆ ئەوە لەو تامەزرۆیە ڕزگاری ببێ و چاوی بە ئەژدەها بکەوێ. قسەکانی کابراش ئەوەندە کاریگەر و مێشکی خەڵکەکەی بە جۆرێ شڵەژاندبوو، یەکێ نەبوو بیر لەوە بکاتەوە کە ئەژدەهایەکی وا، چۆن لە سندووقێکی وا بچووکا جێگای ئەبێتەوە.

کابرا بەم جۆرە قسانە هەر هانی خەڵکی ئەدا هەتا دنیا بوو بە پاش نوێژی شیوان و تۆزێ تاریکایی داهات. خەڵکەکەش ئەوەندە وەڕز بوون؛ هی وا بوو ئەجووڵا بۆ ئەوە بچێ پەلاماری بدا بەڵام هیتر دەستی ئەگرت.

کابرا کە زانی بە تەواوی دەستی خۆی وەشاند و دنیا تاریك بوو، وە لەوانەشە ئەگەر زیاتر بکێشێ، لێدان ئەخوا، هێنای چارۆکەکەی کۆکردەوە. توورەکەیەکی دەرکرد هەموو پارەکەی ڕژاندە ناویەوە، لوولی دا و خستیە باخەڵیەوە، چارۆکەکەی بەست بە سەریا. هەردوو چاکی لێ بەلادا کرد، سندووقەکەی هێنایە پێشەوە. دەستی کرد بە «یاهوو، یامەنهوو، پیری هەمەدان و سوڵتان ئیسحاق، شای مەولاناوا و شاسواری مایدەشت، کڵاوزێڕینی کرماشان و تاجداری خۆراسان، گومەزی قەندەهارو مەزارگەی بوخارا، هوو مەدەد یا عەلی!»

ئەمانەی وت و دەستی برد سەری سندووقی لادا، توولە سوجە مارێکی دەرکرد و گرتی بە دەستیەوە. خەڵکەکە کە ئەمەیان دی، هی خوێن‌گەرمیان تیا هەبوو، پەلاماریان دا، هی‌تریش هەبوو ئەیوت: وازی لێ بێنن ئەم باوەحیزە. کابراش سندووقەکەی خێرا دایە بن هەنگڵی و توولە مارەکەی گرت بە دەستیەوە، پێیەکی هەبوو چواری‌تری بۆ قەرز کرد، دڕنی دا بە خەڵکەکە. دنیاش بە تەواوی تاریك بوو، بۆی دەرچوو خۆی دەرباز کرد و کەس نەیزانی بۆ کوێ چوو.

**٢٤١.** لە کوردستانی ئێرانا بەتایبەتی تا دوایی هاتنی جەنگی گەورەی یەکەم(١٩١٤ - ١٩١٨) دەرامەتی میری لە وڵاتا بەو جۆرە بوو: کە هەر بەگ وەیا ئاغا وەیا خانێك کەوا خاوەن گوند و دێهات بوون، دوای ئەوە کە حاسڵات هەڵئەگیرا ئەو مالکە ئەچووە ئەو شارە کە گوندەکانی ئەو کە سەر بەوێ بوون، لەگەڵ حوکوومەتی ئەو شارەدا ـ کە سەر بە شا بوو ـ ڕێ‌ئەکەوت ساڵێ ئەوەندە پووڵ بدا بە میری. ئەمەی پێی ئەوترا «ماڵیات». ئەمجا ئەو مالکە بێجگە لە حەقی ملکانەی خۆی، ئەو پارە لە

مسکینەکان کۆی ئەکردەوە ئەیدا بە حوکمەت. ئیتر دەرامەتی حوکمەت لەم سووچەوە بریتی بوو لەوە.

وەکوو دەرئەکەوێ ئەم ڕەوشتە هی سەردەمی کۆنی حوکمەتانی فارس بوو مابووەوە، وەیا هی سەردەمی سەدەی چوارەمی هیجری بوو بە چاو حوکماتی ئیسلامییەوە.

**٢٤٢.** «فەقێ قادری ڕەباتی» پیاوێکی پیاوانە و قسەزان و بەدەسەڵات بوو. لە وەختی خۆیا یەکە پیاوی «شێخ مەحموودی حەفید» بوو. وتی: لە هیچ شتێك ناتەواویم نەبوو: لە ماڵ، لە وڵاخی چاك، لە ئەولاد. لەگەڵ شێخ مەحموودا چووین بۆ کەرکووك و میوانی «سەید ئەحمەدی خانەقا» بووین. ئەو سەردەمە پیاو نەبوو لە وڵاتی کەرکووکدا ناوی هەبێ تەنها «سەید ئەحمەدخانەقا» نەبێ. تەنها مەعموورەکانی حوکمەت بەیانیان پێش چوونە دایەرەیان و ئێواران لە کاتی گەڕانەوەیانا تا نەچوونایە دیوەخانی سەیدئەحمەد و قاوەیان نەخواردایەتەوە نەئەچوونە سەر ئیش و لای ماڵی خۆیان. کە چووین، چەند ڕۆژێك لەلای سەید بووین.

ڕۆژێك سەید پێی وتم: «فەقێ قادر ئەتەوێ دەوڵەمەندێکی تەواو بیت و بێئەقڵ بی. یا ئەتەوێ پیاوێکی ژیر و دانا و لات بیت؟».

منیش ئەوا دیارە لە سامانی دنیا لەسەر هیچ پەکم نەکەوتووە و نایەت بە دڵما کە ئەم سامانەی من هەمە لە دەستم بێتەوە. وتم: وەڵڵا جەنابی سەید ئەوەی دووهەمم ئەوێ. فەرمووی ئەوا بۆم مۆر کردی.

دنیا پەردەیەکی تری بە سەرا هات؛ ڕۆژ ئەهات، ڕۆژێکی تری بەدوادا هات. دەوری شێخ مەحموود نەما، منیش وردەوردە ڕووم کردە کزی. ژن

مرد، ماڵم لە دەست بووەوە، وڵاخی کەحێلە هەمووی تیاچوو، ئەولاد دنیای باوکیان بەجێ‌هێشت، هیچم بە دەستەوە نەما؛ هەر مامەوە خۆم و خۆم.

ئەم ماوەیە بیست‌ودووساڵی پێ‌چوو. لەدوای بیست‌ودووساڵە ڕێم کەوتەوە کەرکووک. لەسەر تیلمە کاغەزێك نووسیم بۆ سەید ئەحمەد: «جەنابی سەید ئەوەی یەکەمم ئەوێ».

ئەویش لە پشتیەوە نووسییەوە: «فەقێ قادر تازە مۆر کرا. هەر ئەوەی دووەمە».

سەید ئەحمەد لە پاش بیست‌ودوو ساڵ تێ‌گەیشت کە وەختی خۆی من چیم وتووە و ئەو چی وتووە!.

**٢٤٣.** هەر فەقێ قادری ڕەباتی گێڕایەوە وتی: میرزای تایبەتی «وەسمان‌پاشا»ی جاف بووم؛ هەس‌ونیسی لە دەست منا بوو، مەحرەمی ماڵ بووم، وەکوو یەکێ لە خێزانی ئەو ماڵە.

جوانی خانمی وەسمان‌پاشا لە هەموو ئەو وڵاتەدا ناوی دەرکردبوو. مێوژە ڕەشکە لە سای گەردەنیا دیار بوو، نە بخۆی نە بکەی هەر تەماشای ئەو باڵا نەمامە و گۆنا ئاڵەی بکەی. بەڕاستی خوا یەکێ لەو شیرین نەمامانە کە دروستی کردبوو، خانمی وەسمان‌پاشا بوو.

ئەمە لە باری جوانی و نازداریدا، لە باری سالاریشا هەر تەنها مەگەر لە دەست خانمی وەسمان‌پاشا بهاتایە کە فەرمانڕەوایی و عەشرەتداری هەموو تۆپی جافی بکردایە تا ئەچووە سنە و سولەیمانی و بانە و شاقەڵا.

وتی: چەند ساڵ بوو لە دڵما بووبوو بە گرێ، کە جارێك من خانمم چاو پێ‌بکەوتایە لەو کاتەدا کە لە خەو هەڵئەستا. چونکە وا چووبووە

دڵمەوە کە ئەو جوانییەی خانم هەیەتی هی داودەرمانە. دەمێك بوو لەو باوەڕەدا بووم، [بە] شوێن هەلێکا ئەگەڕام. کتوپڕ ڕۆژێك بۆم هەڵکەوت: سەرلەبەیانی بوو، هێشتا خانم لە خەو هەڵنەستا بوو، بە بیانووی هێنانی قەڵەم و کاغەزێك لە ژوورەکەدا کە خانمی لێی نوستبوو چوومە ژوورەکەوە. منیش مەحرەم بووم، ئەمتوانی هاتوچۆی کەم.

هەر کە سەرم کرد بە ژوورەکەدا خانم گۆشەی کوللەی سەر تەختەکەی لادا و لەناو جێگاکەی هەستا و زەردەخەنەیەك گرتی.

بەڵام هەستانێکی وا هەروەك مانگ لە کەل بێتە دەرەوە ئاوا بوو. بەڕاستی خانمم لە جۆشی نیوەڕۆ و سەرێوارەدا چۆن چاوپێ‌کەوتبوو، لەو کاتەشا کە لەو ناو جێگای بەیانییەدا لە ناکاو هەستا، هەر وابوو.

تۆزێ لە زەردەخەنەکەی تەریق بوومەوە. وتی: فەقێ قادر! ئەزانم بۆچی هاتووی؟ وتم: بۆچی هاتووم خانم؟ وتی: بۆ ئەوە لەم وەختەدا هاتووی کە من ببینی، بزانی ئەو جوانییە کە من هەمە لە وەختەکانی‌ترا، هی داودەرمانە یا هەر هی خۆمە؟ فەقێ قادر! من داودەرمان ناکەم، خوا دوو بەهرەی جوانی وماڵی پێ داوم. بە داودەرمان و بە پیسکەیی کفرانی ئەو دوو بەهرەیە ناکەم.

وتم: خانم چۆنت زانی کە من بۆ ئەوە هاتووم؟ وتی: «بەوەدا زانیم، هەر کە سەرت کرد بە ژوورەکەدا لە پێشا سەیری منت کرد، ئەمجا چاوت برد بەلای قەڵەم و کاغەزەکەوە».

بەڕاستی ئیتر ئیمانم بەوەش هێنا کە زەکا و زیرەکی خانمی وەسمان‌پاشا کردبووی بەو خانمە کە دەستەجڵەوی ئەو هەموو عەشرەتەی گرتبووە دەست.

پاشان وتم: وەڵڵا ئەوی ڕاستی بێ خانم، ڕاست ئەکەی بۆ ئەوە هاتبووم.

خۆ هیچ لۆمەیەکم ناکەی؟ وتی: کوڕم! تۆ کوڕی ئێمەی، ئەگەر ئێمە تۆمان بەکوڕی خۆمان دانەنابێ، تۆ وا بەو جۆرە سەربەست نابی لە هەموو ژوور و بەری ئەم سەرایەدا!.

٢٤٤. «ئەشرەفاغای ڕەباتی» پیاوێکی بەناوبانگ و دیاری بوو. لە سەردەمی تورکەکانا حوکوومەتی ئەستەموڵ ئەکاتە سەر والی مووسڵ کە بیگرن و بە دەستی بەستە بینێرن بۆ ئەستەموڵ؛ چونکە ئاوی لە حوکوومەتی ئەستەموڵ لە وڵاتی سەنگاودا لێڵ کردووە. والی ئەمر ئەکاتە سەر قائیمقامی کەرکووك کە بچێ بیگرێ.

قائمقام بە خۆی و دووسەد ئێستر سوارەوە لە ناکاو ئەدا بەسەر «ڕەبات»دا و ئەچێتە ماڵی ئەشرەفاغا، خۆی لە ماڵ نابێ. دەمی نیوەڕۆ ئەبێ. «شەمسەخانی» کچی کاکل‌ئاغای فارساغا خێزانی ئەشرەفاغا ئەبێ. نانی نیوەڕۆ ئەنێرێتە دیوەخان. دووسەد سینی، هەر سینییەك بریانییەکی لە سەرە. لە ماوەیەکی زوودا ئەم نانە بەم جۆرە حازر ئەبێ.

نان ئەخورێ. پاشان قائیمقام سەرێك ئەخاتە بەر خۆی و ئەڵێ: «سوار، سوار بن، زۆر حەیفە خانەدانی وا کە ژنی وای تێدا هەبێ کوێر بێتەوە. من بۆ گرتنی ئەشرەفاغا هاتبووم، بەڵام شاژنی شەمسەخان نەیهێشت کە ئەم خانەدانە کوێر بێتەوە». ئیتر لێ ئەدا ئەڕوا. وەڵامی والی ئەداتەوە کە هەر شتێك لە وڵاتی سەنگاو ڕووی دا لە ئەستۆی من بێ.



# وڵامی بێ وەڵام

٢٤٥. کابرایەك لە کەرکووك هەتیوێکی تاو دابوو، شوێنی دەست نەکەوت. سەیری کرد دەرگایەك کراوەتەوە و دالانێکی لێیە. لەگەڵ هەتیوەکە چوونە ئەوێ. کابرای خاوەن‌ماڵ لە دەنگی هەتیوەکە بەئاگا هات و هات سەیری کرد شتێکی وایە. وتی: چۆن ئەبێ لەو دالانی حەوشەی منا شتی وا بکرێ؟ هەر درێژەی دا بە قسەی و نەیبڕیەوە. وا دیاربوو هەتیوەکە لەمە تووڕە بوو و پێی ناخۆش بوو، وتی: «مردووت مرێ! چییە نایبڕیتەوە؟ تۆیش وەرە لەناو دالانی ئێمەدا ئەوەندە بدە هەتا چاوت دەردێت!».

٢٤٦. شێخ قادری سیامەنسوور بە شێخ حەبیبی تاڵەبانی ئەڵێ ـ کە هەردووکیان خزم بوون ـ: بیستوومە هەرکەس هەتیوێك وا لێ‌بکا لە ڕۆژی قیامەتا هەتیوەکە سواری سەر شانی ئەبێ. شێخ حەبیبیش ئەڵێ: «بەخوا شێخ قادر! هەموو کەسێکم پێ هەڵئەگیرێ بەڵام تۆم پێ هەڵناگیرێ!».

٢٤٧. کاك مەسعوود محەمەد گێڕایەوە وتی: ئەوا لە بەغدا لە جێگایەك دانیشتبووین، کتوپڕ لەو کاتەدا «عبدالرّحمان نورجان» هات و قسە لەگەڕان بە ترمبێل کرا لە ناو شاردا. عەبدوڕڕەحمان وتی: وەڵڵا بابم من ئەم دوو لاقانەم مانگی چوار دینارم بۆ دەگێڕێتەوە.

«عبدالصمد حاجی محمد» هەڵیدایە وتی: «ئەگەر دوو لاقی‌کەت ببوایە مانگی هەشت دینارت لۆ دەگەڕایەوە!».

٢٤٨. دیسان هەر ئەو بۆی گێڕامەوە وتی: هەر لە بەغدا لە جێگایەکی زۆر جەنجاڵ دەرچووین، دەستەیەك لە دزەییەکانیش هەر لەو شوێنە دەرچوون و ڕوویان کردە ئێمە: وتیان: پەکوو لە وی قەرەباڵغەی! سەگ ساحبی خۆی ناناسێتەوە. خێرا سەمەد وتی: «ئەی کوو ئێوە ئێمەتان ناسییەوە؟!» .

٢٤٩. حەسەن‌بەگی عەلی‌بەگی جاف بۆی گێڕامەوە وتی: لە خزمەتی سەید ئەحمەدی خانەقادا دانیشتووین. شێخ «علاءالدین»ـی بیارە هەموو دەم سکی ژانی ئەکرد و «وەتەبا ـ فەتق»ـیشی هەبوو. سەید فەرمووی: ئەو سك‌ژان کردنەی ڕەنگبێ زیاتری لەبەر وەتەباکە بێ. وتی: منیش وتم: ئاخۆ جەنابی سەید ئەو وەتەبایە لە کام لای بێت؟ ئەویش وتی: «چووزانم حەسەن‌بەگ، خۆ دەستم بە گونیەوە نییە!».

٢٥٠. پیاوێك هەبوو لە «سنە» مەولووی ناوبوو؛ نەخۆش ئەکەوێ ئەچێتە لای حەکیم برایم. حەکیم برایم پسوولەی بۆ ئەنووسێ بۆلای سەی‌شەریفی دەوا فرۆش بۆ دەرمان. مەولوو ئەچێ دەرمانەکە ئەکڕێ، بەڵام نایخوا. پاشان ئەچێتەوە بۆلای حەکیم برایم و ئەڵێ چاك نەبوومەتەوە. ئەویش ئەڵێ: دەرمانەکەت خوارد؟ ئەڵێ: نەء. ئەڵێ: سەندیشت؟ ئەڵێ: بەڵێ. ئەڵێ: ئەی بۆچ نەتخوارد؟ ئەڵێ: «حەکیم برایم تۆ پووڵت خەرج کردگە تا بووگی بەم حەکیمە، ئەشێ زننەگانی بکەی. ئاغەی سەی شەریفی دەوا فرۆشیش پوولی سەرف کردگە تا بووگە بەو دەوا فرۆشە، ئەویچ ئەشێ زننەگانی بکات. منیچ پوولم داگە بە دەواکە

و نەمخواردگە گەرەکمە بمێنم و زننەگانی بکەم»!.

٢٥١. ئەحەی سەرزل هەبوو (هەر لە ڕاستیشدا سەری زل بوو) ئەچێتە بازاڕی کڵاوفرۆشەکان لە سولەیمانی و ئەچێتە بەر دووکانی کابرایەك؛ لەوێدا کڵاوێکی بە ئەندازەی سەری خۆی بە هەرجۆر بێ دەست ئەکەوێ، بەڵام لە نرخەکەیا لەگەڵ کابرای دووکانداردا ڕێ ناکەون. کابرا پێی ئەڵێ: برام مەڕۆ کڵاوێکی وا زلت لەم بازاڕەدا دەست ناکەوێ. ئەحەش ئەڵێ: «برام ڕاست ئەکەی، بەڵام تۆیش بمدەرێ، چونکە پیاوێکی‌تری وا سەرزلت لەم بازاڕەدا دەست ناکەوێ!».

٢٥٢. لە سولەیمانی ئەحمەدی عزیزاغا و میرزامارف زۆرتر پێکەوە ئەگەڕان. ڕۆژێك ئەحمەدی عەزیزاغا و حاجیاغا لە دووکانەکەی حەمەسەعیدی خەیات پێکەوە دانیشتبوون، میرزا مارف بە تەنیا بە بەر دووکانەکەدا تێ‌ئەپەڕێ. حاجیاغا ئەڵێ: «لە جسناتی هەردووکتان بم!» ئەحمەدی عەزیزاغا هەڵئەداتێ خێرا ئەڵێ: «لە جسناتی هەرسێکیان بەرم!» حاجیاغا ئەڵێ: سێیەمەکە کێیە؟ ئەحمەدی عەزیزاغا ئەڵێ: «دووەمەکەم پێ بڵێ، تا سێیەمەکەت پێ بڵێم»!.

٢٥٣. مەلا سمایلی کانیسکان وەعزی ئەدا ئەیوت: هەرکەس سواری هەتیوێك بووبێ، ئەبێ لە ڕۆژی قیامەتا ئەو کابرایە هەتیوەکە بخاتە سەر شانی و لەو دەشتی مەحشەرەدا بیگێڕێ. «عەبەخەیات» هەبوو لە کۆڕەکەدا، هاواری کرد وتی: ئای ماڵی وێرانم! من ئەبێ ئەو ڕۆژە هەتیو هەڵبگرم! ئەم هەمووەم لە کوێ پێ هەڵئەگیرێ؟ مەلا سمایل هەر لە ناوەندی وەعزەکەدا هەڵیدایە و وتی: «خەمت نەبێ هی واش هەیە تۆ هەڵبگرێ و ئەو ئەرکەت لە کۆڵ بخا»!.

٢٥٤. سەی حسێن هەبوو خەڵکی سنە و کوێر بوو. هەر کوێری زکماك بوو، ئیشی هەر گەڕان بوو بە وڵاتانا. ڕۆژێك لەو وڵاتی موکریانە مەلایەك لێی ئەپرسێ: ئاغەی سەی حسێن! لە کتێبا ئەفەرموێ: ئەگەر خوا نیعمەتێکی لە یەکێك وەرگرتەوە لەباتی ئەوە نیعمەتێکی تری ئەداتێ؛ خوا کە نیعمەتی چاوی لە تۆ وەرگرتووەتەوە و کوێری کردووی، چی تری پێی داوی؟ سەی حسێن ئەڵێ: «جەنابی مامۆستا، چ نیعمەتێك لەوە باشترە کە ڕووی جەنابت نابینم؟»!.

٢٥٥. حەمەئاغای حەمەعەلی ئاغای مەنگور کوڕێکی هەبوو ئەولقادری ناوبوو. ئەم ئەولقادرە مناڵ بوو، زۆر لاسار و چەتوون بوو، بەتایبەتی لەگەڵ دایکیا، هەر هیچ بەگوێی نەئەکرد. باوکی پێی وت: ئاخر ڕۆڵە چۆن ئەبێ بەگوێی دایکت نەکەی؟ ئەویش ئەڵێ: «بابە! خۆ دایکم ژنی من نییە بەگوێی بکەم»!.

٢٥٦. عەلی ئۆفێك هەبوو لە سولەیمانی؛ جارێك ئەچێتە لای حاجی برایماغای خەفاف داوای چوار لیرەی لێ ئەکا بە قەرز. حاجی برایماغا ئەڵێ: عەلی! من تۆ ناناسم تەنها جارێك نەبێ لە داڵانەکەی ماڵی میرزا تەوفیقا تۆم چاوپێکەوتووە. ئەمەش نابێتە هۆی ئەوە کە ئێستە من بێنم چوار لیرە بدەم بە تۆ. عەلیش ئەڵێ: «حاجی برایماغا ئاخر منیش بۆیە داوای چوار لیرەت لێ ئەکەم، چونکە نامناسی؛ ئەگەر بمناسی چوار پوولیشم نادەیتێ!». حاجی برایماغا دەست ئەکا بە پێکەنین و ئیتر نازانم ئەنجامیان بەچی گەیشت.

٢٥٧. شێخ مارفی قەرەداغی و مامۆستا مەلا کەریم جارێك لە بەغدادا سواری «پاس» ئەبن و بە تەنیشت یەکەوە دائەنیشن.

پاشان ژن و کچێکی زۆر سەر ئەکەون و بە پێوە ڕائەوەستن. شێخ مارف ئەیەوێ مەلا کەریم بترسێنێ ئەڵێ: مامۆستا وەڵڵا پەنجا فلسم نەدەیتێ هەڵئەستم بۆ ئەوە کچێك لە تەنیشتتەوە دانیشێ. ئەویش ئەڵێ: «کاکە شێخ مارف، سەد فلست ئەدەمێ و هەستە!».

٢٥٨. ئیسحاقەجوو هەبوو لە سولەیمانی، ڕۆژێکی مانگی ڕەمەزان لە نیوەڕۆدا ئەچێ بۆ لای عیززەتی فاتە لەماڵەوە؛ سەیر ئەکا عیززەت نان و کەباب ئەخوا. ئەویش بەبێ قسە دائەنیشێ و لەگەڵیا دەست ئەکا بە نان و کەباب خواردن. عیززەت ئەڵێ: گۆشتی ئەم کەبابە موسڵمان سەری بڕیوە تۆ چۆن لێی ئەخۆی؟ ئیسحاقیش ئەڵێ: «عزەت ئەفەندی لە جوویشا جووی وەکوو من هەیە؛ وەکوو لە موسڵمانا موسوڵمانی وەکوو جەنابیشت هەیە!».

٢٥٩. لە بەغدا بە «دانا»ی کوڕم وت: با بچین باوڵێك ئەکڕم و تۆ بیهێنەوە بۆ ماڵ. زۆر گەورە بوو، خۆیشم لێی پەشیمان بوومەوە. لە پاشا وتم: دانا ئەمە چی لێبکەین؟ وتی: «بابە! چی لێ بکەین؟ من بخەرە ناویەوە خۆت هەڵیبگرە تا ئەچینەوە بۆ ماڵەوە!».

٢٦٠. مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی ئەمیر گێڕایەوە وتی: لە تاران لە کتێبخانەیەك لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، مێزێك لە بەردەمیا بوو. عەینەکێکی کردبووە چاوی. عەینەکەکە هاتبووە سەر لووتی، کتێبێکی بە دەستەوە بوو، خۆی خستبوو بە پشتا سەیری کتێبەکەی ئەکرد. بەرانبەر بەو لەو بەری مێزەکەوە دووکچ دانیشتبوون. ئەوانیش کتێبیان ئەخوێندەوە. یەکێ لە کچەکان ئەو دیمەنەی مەلا جەمیلی پێ سەیر ئەبێ، بەو

عەینەکە و بەو دانیشتنەی، ئەڵێ: مامۆستا ئەوە بۆچ عەینەکەکەت هاتووەتە سەر لووتت و وا شت ئەخوێنیتەوە؟ ئەویش ئەڵێ: «کچم! ئەوە بە عەینەکەکە سەیری کتێبەکە ئەکەم و بەبێ عەینەکەکەش سەیری ئێوە ئەکەم!».

٢٦١. بەربەرەکانێ و یەك نەویستنی شێخ ڕەزای تاڵەبانی و شوکری فەزڵی لە سەردەمی خۆیا دەنگی دابووەوە. ڕۆژێك شێخ ڕەزا ئەیەوێ پلارێکی تەنگەبڕ بگرێتە شوکری فەزڵی ئەڵێ: «میرزا شوکری! بەڕاستی باوباپیر و نەژادی تۆ بوون بە نەنگ و عار بەسەر تۆوە».

شوکری فەزڵیش ئەڵێ: «بەڕاستی شێخ ڕەزا، تۆش بووی بە عەیب و عار بەسەر نەژاد و باوباپیرتەوە». شێخ ڕەزا ئیتر هیچی پێ ناوترێ.

٢٦٢. خاڵەهاشم هەبوو لە سولەیمانی لەگەڵ شێخ بابەعەلیدا سەروسەودایەکیان هەبوو. خاڵەهاشم بەقاڵ بوو، بە شەو و بە ڕۆژ خەریك بوو؛ هیچ پشووی نەئەدا. ڕۆژێك لەسەر حەوزی مزگەوتەکە «ترێ»ـی ئەشۆردەوە. شێخ بابەعەلی لێی پرسی: هاشم ئەوە چی ئەکەی؟ هاشمیش زۆر وەڕس بووبوو، وتی: قوربان چووزانم ئەمە پەنجا ساڵە ئیش ئەکەم ئەم مەشکە ڕەشە ئەیخوا هەر تێر ناخوا و زیاتر داوام لێ ئەکا (مەبەستی بە مەشکەڕەش سکی بوو).

شێخ بابەعەلیش وتی: «جا وەرە تۆش تۆڵەی لێ بکەرەوە؛ بێنە ماوەیەك تۆ ئیش مەکە با ئەو کار بکا و ئەمجا تۆ بیخۆ!».

٢٦٣. پیاوێك هەبوو قادری ناو بوو؛ ڕۆژێك ئەچێتە لای «کوێخاحەویز»ی شاخەپیسکە ـ کە خزمیشی بوو ـ ئەڵێ: کوێخا تا ئێستە ئەوەتە دوو ژنیشم هێناوە کەچی هیچ مناڵێکم نابێ، نازانم

چ بکەم؟ ئەویش: ئەڵێ: «ئەمجا بچۆ ژنێکی ئاوس بێنە!».

٢٦٤. کوڕێك لەو سەرە تەماع ئەکا لە نەنکێکی خۆی (دایکی باوکی) و ئەچێتە [سەر] سکی، لەو کاتەدا باوکی دێ بە سەرا. کە ئەوە ئەبینێ هاوار ئەکا هەی هەتیوە زۆڵە ئەوە چی ئەکەی؟ کوڕەش بەدەم ئیشەوە لایەکی لێ ئەکاتەوە و ئەڵێ: «باوە تۆ ئەمە چل ساڵە دایکی من ئەگێیت، هیچ دەنگ ناکەم، من جارێك دایکی تۆم گا کردت بەم هەرایە!».

٢٦٥. مەلا عوسمانی کوڕی مەلا ساڵحی کۆزەپانکە ڕۆژێك لە ژووری دەرسا ـ پۆلی شەشی سانەوی ـ قوتابییەك لێی ئەپرسێ: مامۆستا مارەبەجاش چۆن ئەکرێ؟ ئەویش بەبێ وەستان ئەڵێ: «بچۆ لە دایکت بپرسە!».

٢٦٦. سەی محەمەدی «هوویە» پیاوێکی لەخواترس و خەڵوەتنشین بوو. چلەخانەیەکی هەبوو، جارجار ئەچوو لەوێ چلەی ئەکێشا. جارێك ئەچێتە ئەو چلەخانەیە بۆ چلەکێشان؛ پیرێژنێك لە ئاواییەکەدا هەموو جار ئەچوو کونێك لە چلەخانەکەدا بوو سەری ئەنا بە کونەکەوە ئەیوت: سەیی گیان! هیچت ناوێ بۆت بێنم؟ ئەویش ئەیوت: نامەوێ. چەند جارێك ئەم پیرێژنە ئەم هاتوچووەی کرد، لە ئاخرا سەی محەمەد وتی: بەڵێ ئەمەوێ. پیرێژنە زۆری پێ خۆش بوو، وتی: چیت ئەوێ بەقوربانت بوونە؟[1] وتی: «ئەمەوێ دوو بەرد و نەختێ قوڕم بۆ بێنی ئەم کونە بگرم، با ئیتر ئەوەندە تۆ نەیەیتە سەرم!».

---

١. ئەسڵی زمانە هەورامییەکە بەم جۆرەیە: «چێشت گەرەکا قوربانەت بوونە».

٢٦٧. حاجی حەمەمینی سیساوا گێڕایەوە وتی: مەلا مەجید هەبوو لە سیساوا پیرێژنێکیش لەوێ بوو «باجی مەیرەم»ـی ناوبوو. ڕۆژێـك باجـی مەیـرەم سـەری ڕێ بە مـەلا مەجید ئەگـرێ، پێی ئەڵێ: مامۆستا! ئەو قوڕە کە خوا ئادەمی لێی دروست کرد، «کا»ی تێدا هەبوو یان نەء؟ مەلا مەجیدیش تۆزێ ئەقڵەکەی تەواو نەبوو، هەر دەست بۆ ناو لنگی باجی مەیرەم درێژ ئەکا و ئەڵێ: «پیرێژنە، ئەگەر کای تێدا بوایە ئەو قەڵشە چی ئەکرد لەوێدا؟»!.

٢٦٨. مەولـەوی تافـی گەنجـی ئەبێ [ئـەڕوا] بۆ ئەوبەری سـیروان. پیاوێکـی قەواڵەیـی پشـتەکەوایەکی ئەداتـێ. ژنی پیاوەکەش ئاسەڕەکەی ئەداتێ، ئەیکا بە کەوا و لەبەری ئەکا. ڕۆژێك کوڕی کابرای قەواڵەیـی تووشـی مەولـەوی ئەبێ، دەسـت ئەدا لە کەواکـەی و ئەڵێ: «ئەمـەوێ یەکێـك لەمـە بکـەم». مەولەویـش ئەڵێ: «لە پشـتەکەی کە هی باوکتە، یا لە بەرەکەی کە هی دایکتە؟!».

٢٦٩. شێخ عارفی تاڵەبانی وتی: ئەوڕەحمان قڕگەیی بۆی گێڕامەوە وتـی: ئـەوا ڕۆژێـك سـەیرم کـرد دوو منـاڵ لـە سولەیمانی لـە مەیدانەکە وەکـوو شـەڕە دەنووکیـان بـێ، وا بـوو. بـە لایانـەوە ڕاوەستام، سـەیرم کـردن، یەکێکیـان دەستەبەرەیەك کولێرەی بەسـەر سـەرەوە بوو ئەیفرۆشت. ئەوی‌کەیان تۆزێ ئەمدیو و ئەودیوی کرد و وتی: ئەمە کەی نانە؟ مەگەر کەری کوڕی کەر بیکڕێ. کوڕەی خاوەن نان بەبێ وەستان هاتە قسە و وتی: «ڕاست ئەکەی، ئێستە باوکت دوو هۆقەی لێ کڕیم!».

٢٧٠. لـە سـەردەمی «محمـد ابـن رسول»ـدا یەکێـك لە «مبشـر»ە گەورەکانـی ئـەورووپا لە ژێـر ناوی بازرگانیدا ڕێـی ئەکەوێتە

سابلاخ؛ بەڵام لە پاڵیا خەریکی پڕوپاگاندە ئەبێ بۆ ئایینی گاوری. ئەچێتە لای ئیبنو ڕەسوول (واتە ڕەسووڵی زەکی) ئەڵێ: «مەلا، ئایا خوا ئەتوانێ ئەم شارە لەناو هێلکەی «فیرنەگولە»یەکدا پیشان بدا بەبێ ئەوە هیچی لێ کەم کاتەوە؟»

مەلا ئەڵێ: بەڵێ، زیاتریش ئەکا! ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: «نابینی چاوی تۆ لە هێلکەی فیرنەگولە بچووکتریشە، کەچی ئەم هەموو کێو و دەشت و دار و دەوەنەی تێدایە! بەبێ ئەوە هیچ جیاییێك لە گەورە و بچووکیدا لە بەینی ئەوان و ئەسڵەکەدا هەبێ؟».



# گەنجی درەخشان

**٢٧١.** مەلا عومەری چۆمەزەردەڵە گێڕایەوە وتی: مام وەسمانی سبیلەك بۆی گێڕامەوە وتی: گرانییەکەی پێشووە، ئەوی پێی بڵێن زادی خودای دەست ناکەوێ؛ بە تەواوی دنیا قاتوقڕە. وراتی دزەیی هیچی لێ نییە. هەندێ قرۆش و مەتالیکمان هەیە لە ماڵەوە، بە وەزن گران و قەبە، بەڵام بە قیمەت سووکە. بە دایکی مندارانم گۆت: لۆم بینە ئەچم بزانم لەو وراتی کۆیە دەستی ئێکێکی پێ نابڕم، بەرکوو شتێکی لێ بستێنم ئەم زستانەی پێوە بەرینە سەر. لۆی هێنام، پڕ بە دەستەسڕێك ئەبوو، زۆر قورس بوو بەرام نرخەکەی هیچ نەبوو.

پارەم خستە باخەرم و چووم لۆ وراتی کۆیە. «چێر» و «گۆلك»ـێکم پێی کڕی و هەندێکیشی مایەوە خستمە باخەرم. چێر و گۆلکم وە پێش خۆم دا و گەڕامەوە تا کەوتمە ناو دزەییان. گەیشتمە نزیکی گوندی «قازیخانە» شەوم بەسەردا هات و دنیاش زستانە؛ باران وەکوو کوندەی سەر بەرەوژێر دێتە خوارەوە. هێندەش ساردە تف هەردەی بە ئاسماندا ئەیبەستێ، هیشکایی بێت و لە لەشما نەمایە. دەشتی دزەییش میوان داناکەن، خۆ قازیخانە لە هەموو خراپتر.

چارم نەما؛ ڕووم کردە گوندێ، ئەچم لۆ هەر مارێ بە خۆم و بە چێرەکەوە دەرم دەکەن، هەم خۆم و هەم چێر و گۆلکەکە وەختە بمرین لە سەرمانا. لە گوندەکەدا مار نەما نەچم تەنیا ماری «مەلا» نەبێ؛ کەس

داینەکردم. ئەمجا بە ناچاری بە خۆم و بە چێرەوە ڕووم کردە ماری مەلا. هێندەم زانی مەلاژن دەرپەڕی و دەستێکی گرت بەم‌لای دەرگاکەوە و دەستێکی بەولاوە، وتی: کابرا بگەڕێوە جێمان نییە. منیش ئیتر دەرەتانم نەمایە، چێر و گۆلکم بە دار گرت و دامە پێش و گێم بە ژنە نەدا و دەستم کرد بە جنێودان و هەر ئەرێم گوو بە گۆڕی، ئەوا هەر ڕووە و پێشیشەوە ئەڕۆم وەکوو ئەوە کە ژنە لەگەر منی نەبێ.

وتی: کابرا ئەوە جنێو بە کێ ئەدەی؟ وتم: بەو گۆڕبەگۆڕە کە منی تووشی ئەم حەزیەتە کرد. لای وابوو مەلا لە دنیادا قاتە تەنها مەلای قازیخانە نەبێ. ژنە تۆزێ شل بووەوە وتی: لۆ، چ بووە؟ وتم: ئەو کابرا لە وراتی کۆیە مردیە ئەم چێر و گۆلکەی کردیە بە ئیسقات لۆ مەلای قازیخانە، لای وایە مەلا لە دنیا بڕایە بەم باران و قیامەتە منی تووشی ئەم حەزیەتە کردیە. ژنە کە گوێی لەم قسەبوو وتی: دەبابم تۆ لۆ دەنگ ناکەی؟ بەر دەرکەکەی بەردا و وتی: فەرموو، ئاخر تۆ بەزەییت بە خۆتا نایەتەوە ئەم بەستەزمانانەت لۆ چ وا تووشی ئەم باران و سەرمایە کردیە؟

خێرا چێر و گۆلکی دایە پێش و کردنیە «تەویلە»وە. مافوورێکیشی لۆ من ڕاخست، ئاگری کردەوە، چوو کەوێ و سەڵتەیەکی‌تری مەلا هەبوو لەگەڵ کراس و دەرپێ، وتی: جلەکانت بگۆڕە با ئەوانەی خۆت هیشک کەمەوە. لەولاشەوە کا و دەسکاوی هەویر و جۆ ئەبا لۆ چێر و گۆلکەکە، چونکە بە هی خۆیانی ئەزانێ. مەلاش لە مار نییە هێشتا لە مزگەفت نەهاتووتەوە. مەنجەڕیشی خستە سەر ئاگر لۆ شێوێ.

پاش ئەمانە زۆری پێ نەچوو مەلاش هاتەوە. مەلاژن مەلای تێ‌گەیاند کە ئەو خوالێخۆشبووەکەی کۆیە چێر و گۆلکێکی بە ئیسقات ناردیە لۆمان. مەلا بەم قسەیە بڕوای نەکرد، بەرام پیاوێکی ئەرباب و خۆش بوو، وتم:

مەلا پیاوەتیت ببێ خۆم دامەزراندییە لێم تێك مەدە. مەلا دەستی کرد بە پێکەنین وتی: جا بەیانی کوو ڕزگار ئەکەی؟ وتم: عسابی بەیانی لەسەر خۆم. بەرام مەلاش لە مەلاژن ئەترسا. مەلاژن لەبەر ئەوە کە چێر و گۆلك بە هی خۆیان ئەزانێ ئەوا هەر ئەچێ بۆ لایان و ئاو و ئالێکیان لۆ دەبات!.

ئەو شەوەمان ڕۆژ کردەوە و بەیانی مەلاژن دیسان شیوی لێ نایەوە و شێومان خوارد. پاش ئەمە ڕووم کردە مەلاژن وتم: مەلاژن ئەتۆ ئەرکت زۆرە با مامۆستا ژنێکی‌تر بێنێ، هەم خزمەتی تۆ ئەکا و هەم خزمەتی مارەکەش ئەکا. هەر ئەمەم وت، مەلاژن گوتی: ئەوە چ دەرێی، چ دەرێی؟ مەلاش لەلاوە گوتی: بابم واز بێنە من پارەم کوا؟ هەر خێرا دەستم کرد بە باخەرما ئەو قرۆش و مەتالیکانە ـ کە مابوونەوە و لەبەر ئەوە لەناو دەستەسرەکەدا بوون، بە چاو زۆری ئەنواند، بەرام هەموویت بخستایەتە سەر یەك سێ مەجیدی نەدەبوون ـ دەرم هێنا و فرێم دایە بەردەستی مەلا وتم: ئەوە پارە.

مەلاژن کە ئەمەی دی بە تەواوی شێت بوو، پەلاماری دامێ دەستەسرە پارەکەی هەڵگرت و خستیەوە باخەڵمەوە. خێرا چوو چێر و گۆلکەکەی دەرکرد، کردنیە دەرەوە هات وتی: هەستە سەگی سەگباب، گوو بە گۆڕی خۆت و ئەو گۆڕەش کە ئەم چێر و گۆلکەی ناردیە لۆ ئێمە. هەستە ئەوە خۆت و ئەوە چێر و گۆلکت. بەو شێخ کەمارە یەك سەحاتی‌تر لەم مارە دانانیشیت.

ئیتر منیش هەستام خواحافیزیم لە مامۆستا کرد و چێر و گۆلکی خۆمم دایە پێش و هاتمەوە. مەلاش بە دزییەوە پێ‌دەکەنی.

٢٧٢. میرزا مارف بۆی گێڕامەوە وتی: لە سەردەمی «مەحمووپاشا»دا مەلایەکی پڕی نوورانی لە هەڵەبجە بوو، ئەم مەلایە تەلاقیشی چاك ئەکردەوە. خۆت ئەیزانی سێ تەلاقە کە بکەوێ بە جاش نەبێ چاك نابێتەوە. ئەم مەلایەش لەبەر ئەوە ئیشی موسوڵمانان پەکی نەکەوێ و شەرعیش ڕێگا بدا، پیاوێکی خەڵکی ئەو سەرشیوە هەبوو «عەبە»ی ناوبوو، ڕاگیری کردبوو بۆ ئەوە ئەگەر جارێك تەلاقێکیان هێنایە لای و بە جاشیش نەبێ چاك نابێتەوە، «عەبە» ببێ بە جاش و نیکاح دروست ببێتەوە. عەبەیش بەو پارەیە کە لە جاشییەوە دەستی ئەکەوت، ئەژیا و ئەوا ئەوی‌تریش هەیە ئیتر بە ڕەحەتی بۆ خۆی قاچی ڕاکێشا بوو.

دیسان لەگەڵ ئەمەشا کە شەرع ڕێگای داوە، وەکوو خۆت ئەیزانی، نە کابرای جاش پێی خۆشە بە ئاشکرا ئەم جاشییە بکا و وە نە کابرای تەلاق‌کەوتوویش ئەیەوێ ئەو ناوە بکەوێتە شوێنی کە پێی بڵێن: تەلاقی ژنەکەی بە مارەبەجاش چاك کردۆتەوە!. بە کورتی ئەمە بۆ هەردوو لایان عەیبە.

پیاوێك هەبوو «حەمەی بارام»یان پێ ئەوت. پیاوێکی کەڵەپیاو و ناسراو بوو، هاتبوو بە سەریا سێ تەلاقەی خواردبوو. هەرچەندە ئەملاوئەولای کرد، تەلاق چاك نەبووەوە، وتیان: باوکم بە خوا بە مارەبەجاش نەبێ چاك نابێتەوە. حەمە وتی: من ئیشی وا چۆن ئەکەم؟ مەگەر ڕووی خۆم ڕەش کەم و وڵاتی هەڵەبجە بەجێ بێڵم. وتیان: برا ئەمە شەرع ڕێگەی داوە، تۆ لەم ژنەت سێ چوار منالی وردت هەیە، بۆ مالی خۆت کاول و منالەکانت دەربەدەر ئەکەی؟ وتی: ماڵم کاول ئەبێ و منالم دەربەدەر ئەبێ قیروسیا، من ئەم پەڕۆوە نادرووم بەسەر شانی خۆما.

هەرچەند لەگەڵی خەریك بوون کەڵکی نەبوو. ئینجا خزمان چوونە

بن دەستی ژنەکەیەوە، کە لەبەر ئەوە ماڵەکەی لێ تێك نەچێ و مناڵەکانی دەربەدەر نەبن، بێنێ مێرد بکا بە «عەبە» و پاشان تەڵاقی بدا و پاش عیددە، حەمە مارەی بکاتەوە. بەڵام ئەم ئیشە نابێ حەمە پێی بزانێ. ژنە و خزمەکانی چوون بۆ لای مەلا مۆمن کارەساتەکەیان تێگەیاند و پێیان وت: کە ئەم قسەیە بڵاو نەکاتەوە لە ئاخرا کە مارەی کردەوە لە حەمە، پێی بڵێت: شەرع ڕێگەی داوە کە مارەی بکاتەوە. لەناو خەڵکیشا وتیان: مەلا مۆمن مارەی ژنەکەی کردۆتەوە لە حەمە، ئیتر کەس قسە ناکا. ئەڵێن: دیارە مەلا مۆمن ڕێگایەکی شەرعی بەبێ مارەبەجاش دیوەتەوە.

ژنە مارە کرا لە عەبە، لەگەڵ مارەکردنا دە مەجیدی خۆیشی وەرگرت و چووە پەردە. پاشان تەڵاقی دا. «عِدّە»ی ئەمیش بەسەر چوو، مەلا مۆمن ناردی بەشوێن حەمەدا کە «قیل»ـێکم بۆ دۆزیوەتەوە ژنەکەی خۆی لێ مارە ئەکەمەوە. حەمەش ئەمەی زۆر پێ خۆش بوو، چوو و ژنی لێ مارە کرایەوە، بەڵام هیچ بە کارەسات نازانێ. لەناو خەڵکیشا بڵاو بۆتەوە کە حەمە سێ تەڵاقەی خواردووە و هیچ مەلایەك بۆی چاك ناکرێتەوە، کەچی ئێستە وا حەمە ژنەکەی هێناوەتەوە. لێیان ئەپرسی: چۆن هێناوتەوە؟ ئەویش ئەیوت: مەلا مۆمن فتوای بۆ دەرکردووم و ئەو بۆی چاك کردوومەتەوە. ئەو هەر لەسەر ئەو قسەیەی خۆی سوور بوو، وە بە ڕاستیشی ئەزانی کە مەلا مۆمن «قیل»ـی بۆ دۆزیوەتەوە. لەگەڵ ئەمەشا خۆی زۆر هەڵئەکێشا کە ژنەکەی بەبێ مارەبەجاش هێناوەتەوە.

لە ئاخرا پێیان وت: مردووت مرێ! تۆ لە کوێ نوستووی؟ ژنەکەتیان بە مارەبەجاش بۆ هێناویتەوە و جاشەکەش «عەبە» بووە. ئەم باسوخواسە هەموو کەس پێی زانیوە تەنها خۆت نەبێ. وتی: کورە نابێ شتی وا؟ وتیان: بەرێوەڵڵا ڕاست وایە. حەمە دەستێکی کەوتە پێش و دەستێکی کەوتە

پاش. تازە چی بکا و ئیش لە ئیش ترازاوە، ئەگەر بار ئەکا بۆی ناکرێ، ئەگەر ئەمێنێتەوە بە چ ڕوویەکەوە لە وڵاتی هەڵەبجە بمێنێتەوە. کەوتە سەر ئەوە کە تۆڵەی خۆی بستێنێتەوە.

ماوەیەك لەم فیکرەدا بوو، لە ئەنجاما هاتە سەر ئەوە کە خۆی بکا بە ژنێکی سێ تەڵاقدراو و مارە بکرێ لە عەبە. هێنای ئەم قسەیەی لەلای چوارکەس لە خزمەکانی خۆی درکان و تەمێشی کردن کە کەس بەم ئیشە نەزانێ.

هەستا جلی ژنانەی لەبەر کرد و ڕیش و سمێڵی خۆی لووس‌لووس تاشی و چارشێوێکی دا بە سەریا و دەنگی خۆی گۆڕی. یەکێ لەو پیاوانە کە قسەی لەگەڵیان کردبوو، کردی بە مێردی خۆی و پێش خۆی دا چوون بۆ لای مەلا مۆمن. کابرا وتی: ئەمە ژنمە و سێ تەڵاقەم خواردووە و ئەبێ چارێکمان بکەی؟ منداڵدارین با سەرمان لێ تێك نەچێ. مەلا مۆمن وتی: باوکم هیچ چارێك نییە مەگەر «تَحليل» نەبێ. کابرا وتی: قوربان تەحلیل چییە؟. وتی: باوکم، تەحلیل ئەوەیە کە ئەم ژنەی تۆ ئەبێ لە یەکێکی کە مارە بکرێ و پاشان تەڵاقی بدا و ئەمجا تۆ بیهێنیتەوە. کابرا وتی: جا مامۆستا ئەمە مارەبەجاشی پێ ئەڵێن، من چۆن شتی وا ئەکەم؟ مەلا مۆمن وتی: دەسا باوکم بەخوا لەمە زیاتر ڕێگا نییە.

کابرا تۆزێ خۆی با دا و دەستی کرد بە منجە کردن، لە پاشا ڕووی کردە ژنە درۆزنەکەی و وتی: تۆ چێ ئەڵێی؟ ژنەش بە نەرمێکەوە وتی: کەیفی خۆتە. ئەمجا پیاوە وتی: باشە مامۆستا؛ بەڵام کەس پێ نەزانێ. مامۆستاش وتی: من پیاوێك لەلای خۆم هەیە هەر ئەم ئیشە شەرعییانە ئەکا و کەسیش نازانێ.

ئەمجا کەوتە ئێوارێ، «عەبە»یان هێنا ژنەی لێ مارە کرد و دە

مەجیدیشیان دایە، هاتە دەرەوە هەر ئەو شەوە پەردە دروست کرا. ژنە چووە ژوورەوە، پاش بەینێك «عەبە»یش چوو بۆ لای. عەبە دەرپێ و مەرپێی داکەند و خۆی ساز کرد و چوو بەلای ژنەوە.

لە ناکاو ژنە چارشێو بەسەری کۆنە حەمە، چارشێوی فڕێ دا و بە خۆی و بە حەیتە بۆریەوە پەڕییە کۆڵی عەبە. عەبە بە تەواوی حەپەسا و دەستی کرد بە هاوار کردن بۆ خاتری خوا بمگەنێ، ئەمە ژن نییە دەعبایە سوارم بووە. حەمەش بەهێزە و کەڵەپیاوە، جوولەی لێ بڕیوە، دەرگاش لە ژوورەوە داخراوە، تا خەڵك فریا کەوتن ئەم بوو بە زاوا. وتی: کەرانباوگاو ئاوا حەقت لێ ئەکەمەوە، ئەمجا بە حەمەی ڕاستەقینە و کێری گواوییەوە لە پەردە هاتە دەرەوە و خۆی پیشانی خەڵکەکە ئەدا.

٢٧٣. حاجی مەحمووی یاروەیسی جاف هەبوو کە لە هۆزی یاروەیسی و لە سەردەمی مەحمووپاشادا بوو. ئەم حاجی مەحمووە پیاوێکی دەوڵەمەند و بە مەڕومالآت بوو، گەلێ کەسی لە بەردەستا بوو کە کردبوونی بە شوانکارە و مالآتی ئەدانێ بۆ کوێستان. هەرچەندە لەگەڵیان ئەکەوتە حەساو کردن، بە جۆرێ خۆیان پیشان ئەدا کە زۆر فەقیرۆکە و گێلۆکەن؛ بەلآم بۆ ماڵ خواردنەکەی ئەم، زۆر وریا و زت و زیندوو بوون؛ ئەمیش هیچ چاری نەئەما پێی ئەوتن: «هەی بۆ خۆتان ئاقڵانە و بۆ من کەرانە».

٢٧٤. لەو سەرە پیاوێك هەبوو «سەمسام»ی ناوبوو. ئەم سەمسامە ناوبانگی پاڵەوانی و ئازایەتی بە هەموو وڵاتا بڵاو بووبووەوە. پیاوێکیتر هەبوو «قەیتەران»ی ناوبوو، ئەمیش هەر بەم جۆرە ناوبانگی پاڵەوانی هەبوو. ڕۆژێك قەیتەران ئەچێ بۆ لای سەمسام پێی

ئەڵێ: من ئەمە قەبووڵ ناکەم کە من خۆم بە یەکە پاڵەوان ئەزانم و کەچی تۆیش ناوبانگی پاڵەوانی دەرئەکەی؟ یا من یا تۆ. ئێستە من بۆ ئەوە هاتووم پێکەوە لە کۆڕێکی گەورەدا زۆران بگرین یا من تۆ ئەدەم بە عەرزا، یا تۆ من ئەدەی بە عەرزا، ئەو وەختە پاڵەوانی بۆ یەکێکمان ساغ ئەبێتەوە، ئەگینا من ئەمەی ئێستا قەبووڵ ناکەم.

سەمسامیش ئەڵێ: ئێستا بەخێر بێی، قسەکەت باشە؛ بەڵام تۆ لە ڕێگاوە هاتووی ئێستە دانیشە و پشوویەك بدە و نانێك بخۆ، پاشان چۆن ئەڵێی وا ئەکەین. قەیتەران دائەنیشێ و پاش حەسانەوە سەمسام پێی ئەڵێ: برام ئێستە کۆڕ و خەڵکی پێ ناوێ، وەرە تۆ پەنجەیەك بخەرە دەمی من و منیش پەنجەیەك ئەخەمە دەمی تۆ، هەردووکمان پەنجەی یەکتری ئەگەزین، کاممان زووتر هاوارمان لێ بەرز بووەوە و وتمان: «ئای» ئەوە ئەو کەسەمان بەزیوە و ئەوی‌ترمان پاڵەوانترە.

بە گەزینی پەنجەی یەکتر، لەوانەبوو پەنجەیان بقرتێ، لە ناکاو قەیتەران وتی: «ئای»، ئیتر پەنجەی یەکتریان بەردا و سەمسام بە پاڵەوانتر دەرچوو. بەڵام سەمسام وتی: «برای خۆم قەیتەران! بەڕاستی من گەیشتبووە تینم، لەسەر زارمەوە بوو کە بڵێم ئای، کەچی تۆ وتت، هەر ئەو کاتە تۆ نەتووتایە من ئەموت!».

**٢٧٥.**ساڵێك تازە ترۆمبێل داهاتبوو، پیاوێك لە «سنە» کارگەیەکی ترۆمۆبێل‌خانەی دانابوو، تا بیست شاگردێك لەوێدا ئیشیان دەکرد. پێویستی بە هی‌تریش هەبوو، بەڵام دەست نەئەکەوت.

ڕۆژێك کابرایەکی «چەولی» سمێڵ بابڕ بە بەر کارگەدا تێ‌پەڕی؛ کە چاوی بەوانە کەوت چووە ژوورەوە سەلامێکی کرد و هەناسەیەکی

هەڵکێشا وتی: ناشوکری نەبێ وەستایان قەدریان نەماوە!. وەستای خاوەن کارگە کە ئەم قسەیەی بیست زانی کە ئەم پیاوە کسمێکی هەبووە و لێی قەوماوە. خێرا وتی: کورسییەکیان بۆ هێنا، کابرای دانا و چای بۆ بانگ کرد و ماریفەتێکی زۆری لەگەڵ نواند و لە دڵی خۆیا وتی: وا دیارە ئەم پیاوە ئەهلی ئەم سەنعەتەیە و خوا ناردوویە با لێرە ئیش بکا. ڕووی تێکرد و وتی: وابزانم جەنابیشتان وەستان؟

کابرا دیسان هەناسەیەکی تری هەڵکێشا و وتی: «ئەرێ بەخوا، منیش بەلای خۆمەوە وەستا بووم». وتی: ئەگەر زەحمەت نەبێ بفەرموو بزانم وەستای چی بوون؟ وتی: «جاڕووب‌بەند». وەستای خاوەن کارگە ئەم کسمەی نەبیستبوو وتی: قوربان جاڕووب‌بەند چییە و مەعنای چییە؟ وتی: «قوربان یانێ گەسك بەست. من وەستای گەسك بەستن بووم». کابرا وتی: ڕاستە، وەستا قیمەتی نەماوە پەلی گرت و کردیە دەرەوە!.

٢٧٦. حاجی برایماغای عەنبار نەخۆش ئەکەوێ، ئەنێرێ بۆ سابڵاخ حەکیمی بۆ بێنن. حەکیم‌عەزرایەك لە سابڵاخ ئەبێ، ئەوی بۆ دێنن. عەزرا دێتە دیوەخان. خزمەتکارەکە ئەچێتە لای ئاغە ئەڵێ: قوربان حەکیم عەزرا هاتووە ئەیەوێ بێتە خزمەتتان. ئاغەش ئەڵێ: «ڕۆڵە بەخوا ئیمرۆ ئەمەوێ کەسم چاو پێ نەکەوێ ناساغم، بچۆ پێی بڵێ: ئاغەم ئیمرۆ نەخۆشە لە جێدا کەوتووە، ناتوانێ بتبینێ!».

٢٧٧. لە قسەی گوێ‌ئاگردانی کوردانەیە ئەڵێ: مەلێك هەیە خواردنی هەر گووە، ڕۆژێك فیکر ئەکاتەوە ئەڵێ: ئەوە بۆچ من هەر گوو بخۆم؟ ئەوە قازە، ئەوە بازە، ئەوە بولبوولی خۆش ئاوازە، گۆشت و گوڵ و شەلەم‌باخی ئەخۆن با منیش بچم وەکوو ئەوان بکەم و وەکوو ئەوان بخۆم.

ماوەیەك ئەڕوا و ئەگەڕێ هیچی دەست ناکەوێ، لە برسا لاکەی دێ و لەوانەیە ها ئێستا ها تۆزێکی‌تر؛ بە ناچاری با ئەداتەوە سەر گوو خواردنەکە، جا هەر دەنووکی لێ ئەدا و سەر بەرز ئەکاتەوە ئەڵێ: «یاڕەبی شوکر، ئەگەر ئەمەش نەبوایە من چیم بکردایە؟»!.

**٢٧٨.** جارێك دوو کابرای کورد لەو کوردەوارییە شەوێك ئەچن بۆ دزی ماڵە جوولەکەیەك. کە ئەچنە ژوورەکەوە سەیر ئەکەن جوولەکە چاوی ئەڕوانێ، پێی ئەڵێن: باوەحیزە ئەوە بەخەبەری؟ ئەویش ئەڵێ: نەوەڵڵا قوربان، بەسەری ئێوە نوستووم، ئەوە تایفەکەمان هەر وایە، چاوزاقین!.

**٢٧٩.** لە دێی «بلەسەن» یەکێ لە ئاغە شڕەکانی ئەوێ جووتیارێکی هەبوو، هەموو ڕۆژێ ئەچوو بیانوویەکی پێ ئەگرت، دەستی ئەکرد بە جنێو پێدان و بە لێدانی. ڕۆژێك جووتیارەکە لێکی دایەوە وتی: ئەمە حاڵ نییە منی تێ‌دام. لە دڵی خۆیا داینا ئەگەر جارێکی‌کە ئاغەکە قسەی پێ بڵێ، ئەم دەست بکا بە لێدانی و هیچ سەری لێ نەکاتەوە. بە ڕێکەوت ڕۆژی دوایی لەسەر جووت بوو، دیسان ئاغە هات و دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ و جنێودان. جووتیارم جووتیار بوو، هەر جووتەکەی بەرەڵڵا کرد و ئاغەی دایە بەر نەقیزە. هاواری ئاغە ئەگەیشتە ئاسمان، ئەوەندەی لێ دا هەتا بە تەواوی پەلوپۆی لێ بڕا و نووزەی تیا نەما.

ئێوارە جووتیار جووتەکەی بەردا و بەرەو ماڵ بووەوە، ناو چەوانی گرژ کرد و دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ، ئاغەژنەکەی لێی پرسی: بۆچی وا حێدزی؟ ئەویش وتی: ئاغەم بێ‌قەزا بێ، هەموو ڕۆژێ دێت لێم ئەدا و ئەمکوژێ، بەتایبەتی ئیمڕۆ بە نەقیزە ئەوەندەی لێ داوم هەموو لەشی

شکاندووم. ژنەکە دڵی پێ ئەسووتێ و ئەچێ بە پیر مێردەکەیەوە پێی ئەڵێ: ئەوە بۆچی تۆ ئەوەندە خراپی هەموو ڕۆژێ ئەچی لەم ڕەنجبەرە هەژارە ئەدەی و ئیمڕۆ بە نەقیزە هەموو لەشیت شکاندووە؟

کابراش لە تاو ژانی لەشی ئاگای لە خۆ نییە، بەڵام بێزی نایە بڵێ: ئەو منی کوشتووە، ئەڵێ: «هەڵبەت، ئیشی چاك نەکا منیش لێی ئەدەم».

.٢٨٠ وەختی خۆی کە ئینگلیز تازە هاتوونە وڵاتەوە کاپتنێك لە سولەیمانی لەگەڵ موختاری گەڕەکەکەدا ناسیاوی پەیدا ئەکا. ئینجا کابرای موختار بەرقاپی ماڵی کاپیتانی گرتبوو، هەرکەس بهاتایە بۆ دیدەنی شتێکی بەرتیل لێ وەرئەگرت و ئەو وەختە ئەچووە لای کاپیتان، ئیزنی بۆ وەرئەگرت کە بچێتە ژوورەوە.

ئاخری کاپیتان پێی زانی کە ئەم کابرایە بۆ خەڵك ڕووتەوە کردن هاتوچۆی ئەکا وتی: ئەگەر هات دەری کەن. هەرچەند خزمەتکارەکان پێیان وت: باوکم ئیتر مەیە کاپیتان پێی ناخۆشە، ئەو بەگوێی نەئەکردن و هەر ئەچوو.

ڕۆژێك لە دەرگا چووە ژوورەوە کاپیتان دەستی دایە دار حەیزەرانێك ئەوەندەی لە سەروگوێلاکی دا هەتا هیلاك بوو، وە بە شەق لە دەرگاکە کردیە دەرەوە. ئینجا هەندێ کەس کە موختاریان ئەناسی و لەبەر دەرگا بوون، بۆ ئەوە کە نەزانن تێی هەڵداوە پێ ئەکەنی و کڵاو و جامانەکەی بەدەستەوە بوو، ئەیتەکان و ئەیوت: «ئەم کاپیتانە پیاوی چاکە چەند یاری و گاڵتەی پێ خۆشە».

.٢٨١ «مێجەرسۆن» حاکمی سیاسی ئینگلیز بوو لە سولەیمانی. خۆت ئەزانی ئینگلیزەکان خزمەتی سەگ زۆر ئەکەن.

مێجەرسۆن سەگێکی هەبوو پیاوێکیشی لا بوو «عەبە سەگ‌کوژ»یان پێ ئەوت. ئەم عەبەیە خزمەتی سەگەکەی مێجەرسۆنی زۆر ئەکرد. ئەیهێنا بە سابوون و لفکە ئەیشۆرد و شانەی ئەکرد؛ جێگای بۆ ڕائەخست و بە دەستی خۆی چێشت و گۆشتی ئەکرد بە دەمەوە. مێجەرسۆن چەند جارێك پێی وت: عەبە! تۆ واز لەم سەگە بێنە چونکە ئێوە موسڵمانن، بەلای ئێوەوە سەگ گڵاوە!، جگە لەوەش ئەمە هەر پێچەوانەی عادەتی ئەم وڵاتەیە!. هەرچەند ئەو وای پێ ئەوت: ئەم زیاتر خزمەتی ئەکرد و بە نیازی خۆی بەم ئیشەی زیاتر خۆی ئەبردە پێشەوە. لە ئاخرا ئیتر ڕۆژێك مێجەرسۆن لە وزەیا نەما وتی: «عەبە واز لە سەگەکە بێنە، بەخوا بچیتە قنگی سەگەکەشەوە نابی بە ئینگلیز!».

٢٨٢. پیاوێکی دراوسێمان هەبوو مودیری قەرەداغ بوو. لەسەر شکاتی خەڵکەکە دەستیان لە ئیش کێشابووەوە هێنابوویانە سولەیمانی؛ ئەویش بۆ ئەو ماوەیە کە ئەمێنێتەوە کارەکەرێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو بۆ ئەوە چێشت و نانی بۆ بکا. مودیر کوڕێکی هەبوو لە مەکتەب ئەیخوێند. لە حەوشەکەدا سەکۆیەك هەبوو، مودیر، دنیا هاوین بوو لەسەر سەکۆکە ئەنوست. کارەکەرەکەشی لەلای خۆی ئەنواند. پەیژەیەك لەسەر بانی مووبەقەکە دانرابوو یەکێکیش لەسەر بانی موبەقەکەوە بۆ سەربانی گەورە دانرابوو. کوڕەکە بە شەو لەسەر بانە بەرزەکە ئەنوست.

شەوێك کوڕە هەڵئەستێ دێتە خوارەوە ئەچێتە جێگای کارەکەرەکە، ئەویش هاوار ئەکا ئاغە ئەوە کوڕەکەت هاتووەتە سەرم. ئاغەش پیاوێکی زۆر دیندار و لەخواترس بوو، لەگەڵ هەڵئەستێ دەست ئەداتە دارێك و بۆی دێ، تەماشا ئەکا ئەوە کوڕە سەری کردۆتە سەر سەرینی کچەتیوەکە

پرخەپرخ خەوی لە خۆ خستووە. باوکی ئەیداتە بەر دار و ڕایئەپەڕێنێ ئەڵێ: «حەرامزادە ئیشت چییە هاتوویتە ئێرە؟» کوڕە سوێند ئەخوا ئەڵێ: بابە بەدەم خەوەوە هاتووم. باوکی ئەڵێ: مردووت مرێ! تۆ قسەیەك بکە باوەڕت پێ بکرێ. لە دوو سەربانەوە بە دوو پەیژەدا بەدەم خەوەوە هاتیتە خوارەوە! ئاخر چلۆن نەکەوتی و ملت نەشکا؟!.

٢٨٣. عەلییە تورکە هەبوو لە سولەیمانی وتی: بە چەتەیەتی ڕێم کەوتە سیوەیل، چوومە دێیەك بووم بە میوانی پیرێژنێك. زۆر خزمەتی کردم؛ تاقە مریشکێکی هەبوو بۆی سەر بڕیم و دەرخواردی دام. لە پاشا کە لێم دا ڕۆیشتم زۆر شەرمەزاری بووم، وتم: «دایە تۆ خۆت ئەزانی من چەتەم هیچ پارە و پوولێکم نییە بتدەمێ، لە تۆڵەی ئەم چاکییەتدا لەگەڵت کردووم هەر ئەوەندە ئەتوانم مەگەر سوارت بم». ئەویش وتی: «دە چاکە بە قوربانی حەمرێت بم! یارەبی حەمرت درێژ بێ و خوا حەفوت بکا».

٢٨٤. ژنێك بە ورگی زلیەوە لەسەر گوێسەبانەیەك بەبێ دەرپێ ڕاوەستابوو، وا دیار بوو سکی پڕ بوو. دەرۆزەکەرێك بەوێدا تێپەڕی و سەری بەرز کردەوە، جەنگەڵستانێکی لە شوێنە دوابڕاوەکەی ئافرەتەکە بەرچاو کەوت، وتی: خانم! چوار پارەم بدی عەرزت ئەکەم ئەم سکەت کوڕە یا کچ!. خانم چوار پارەکەی دایە و کابرا وتی: خانم سکەکەت کوڕە. ژنە وتی: بە چیدا ئەیزانی؟ وتی: «بەو جۆرە کە تۆ لەو سەرەوە ڕاوەستابووی من قەفی سمێڵەکانیم لێرەوە چاوپێکەوت».

٢٨٥. کابرایەکی «داربەڕوولە»یی بارێ شووتی هێنابوو بۆ سولەیمانی بیفرۆشێ. کابرایەکی شاری لە قەراخ شار تووشی بوو لێی پرسی:

توخوا برا ڕێگای «وێڵدەر» کامەیە؟ کابرای خاوەن شووتی وتی: «بارەکەم شووتییە». ئەویش وتی: من ڕێگای وێڵدەرت لا ئەپرسم!. کابرا وتی: «برا! بارە، گەورەشی تیایە و بچووکیشی تیایە».

کابرای شاری وتی: هەی‌هەی! دۆشاو بە گونت، من چی پێ ئەڵێم و ئەو چی ئەڵێ؟ وتی: برا! بچووکەکان یەکێ بە قڕانێك، گەورەکان یەکێ بە دوو قڕان. کابرا ئیتر وازی لێ هێنا.

**٢٨٦.** ئەو بۆی ناردم: عەبەی تەڵەمشك هەبوو لە سولەیمانی کارگەچی بوو. ئەم عەبەیە خوشکێکی هەبوو «فاتەی تەڵەمشکیان» پێ ئەوت. فاتە بە واتەی واتەبێژانی سولەیمانی شەوگەردی ئەکرد. عەبە لەمە زۆر تووڕە ببوو. لە مزگەوتی شێخ جەلال دانیشتبووین، مەلا ئەوڕەحمانێکی سەقزی هەبوو لەوێ لە خزمەت شێخ بابەعەلیدا ئەیخوێند. دانیشتووین، عەبە هاتە سەر چۆك و سەری پەنجەی ئاراستەی مەلا ئەوڕەحمان کرد و لە تووڕەییدا کەفی ئەچەراند و وتی: «فاتەی تەڵەمشك نانت نییە؟ فاتەی تەڵەمشك ئاوت نییە؟ فاتەی تەڵەمشك جێگات نییە؟ فاتەی تەڵەمشك بۆچی گان ئەدەی؟ بۆچ حەیای من و خۆیشت ئەبەی؟ فاتەی تەڵەمشك؟!

لەوانە بوو پەنجەکانی بچێ بە چاوی مەلا ئەوڕەحمانا. مەلا ئەوڕەحمانی هەژاریش کە سەیری کرد وا لەم ئیشەدا بوو بە کەسی دووەم و بوو بە فاتەی تەڵەمشك، هەر وا واقی وڕ ما و تف لە دەمیا وشك بوو، هیچ دەنگی نەئەکرد. عەبەش هەر لەسەر قسەی خۆی نەئەکەوت و لای وابوو نە بای هاتووە و نە بۆران.

٢٨٧. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: مامە شێخ مستەفام ـ شێخ مستەفای شێخ نەجیب ـ هاتە مزگەوتی ئێمە. عەبەی تەڵەمشك هەستا قوتوو جگەرەکەی خۆی کردەوە جگەرەیەکی دا بە مام شێخ مستەفام و بۆشی داگیرساند. بەلای جگەرەکێشەوە کە جگەرەی گۆڕی پێی ئەکۆکێ، مامە شێخ مستەفام دەستی کرد بە کۆکە و وتی: عەبە جگەرەکەت توندە. عەبەش هیچ سێ و دووی لێ نەکرد وتی: «قوربان جگەرەکەم نێرەکەر ئەترێنێ». ئەمەی هەر ئەوتەوە، ناچار مامە شێخ مستەفام هیچ دەنگی نەکرد، هەر ئەوەندە نەبێ وتی: «باشە، باشە عەبە».

٢٨٨. فەقێ محەمەدی هەمەوەند مودیری ناحیەی بازیان بوو. ددان تازە داهاتبوو، تاقمە دانێکی دروست کردبوو، خستبوویە دەمی.

ئەم فەقێ محەمەدە بە ناوی مودیرییەوە وەیا عەشایرییەوە ئەچێ بۆ «تەکیە»ی قەرەداغ، میوانی نووری شێخ بابەعەلی ئەبێ؛ کە شێخ نووریش بەشێکی لە عەشایریدا هەبوو. شێخ نووری پیاوێکی ئەبێ فەقێ محەمەدی ناو ئەبێ.

لە کاتی نیوەڕۆدا سینی نان دائەنرێ. فەقێ محەمەدی هەمەوەند بە دانەکانیەوە نانی بۆ ناخورێ، دانەکانی دەردێنێ و لەسەر سینییەکە دایئەنێ. پاش نان خواردن لە بیری ئەچێتەوە هەڵیبگرێتەوە، فەقێ محەمەدی پیاوی شێخ نووری سینییەکە هەڵئەگرێ، ئەوی لە سەری ماوە خزمەتکار ئەیخوا و ئێسقان و خەوش و خاڵەکە ئەڕێژێنێتە سەرەنوێلکەکە، سەگەلی لێ کۆ ئەبێتەوە. چی ماوە ئەوانیش ئەوە ئەخۆن. فەقێ محەمەدی پیاوی شێخ نووریش نازانێ لەسەر ئەم سینییە ددان هەیە، وە بەڵکوو خەڵکی

ئەو وڵاتە ئەمە هەر نازانن کە ددان دروست کردنەوە هەر داهاتووە.

لە پاش ماوەیەك فەقێ محەمەدی هەمەوەند ددانەکانی ئەکەوێتە فیکری ئەڵێ: شێخ نووری ددانەکانم لەسەر سینییەکە بوو چێ لێ‌هات؟ شێخ نووریش فەقێ محەمەدی پیاوی بانگ ئەکا و ئەڵێ: کوا ددانەکانی فەقێ محەمەد؟ سینییەکەت چی لێ‌کرد؟ ئەوان بە شێخ نوورییان ئەوت: کاکە نووری. ئەڵێ: وەڵڵا کاکە نووری سینییەکەم ڕشتە بەر سەگ. فەقێ محەمەدی هەمەوەندیش هەر ئەڵێ: کوا ددانەکەم؟ شێخ نووریش نازانێ چی بڵێ. لە ئاخرا چار نامێنێ ئەڵێ: «وەڵڵا فەقێ محەمەد ددانەکانت کرایە بەر سەگ و سەگ خواردی». ئەڵێ: کێ وای کرد؟ ئەڵێ: فەقێ محەمەدی پیاوی من. ئەڵێ: «دەسا کوڕە، گوو وە گۆڕ باوك هەرێ ناوی فەقێ محەمەدە». شێخ نووری ئەڵێ: «ئاخر تۆ خۆیشت فەقێ محەمەدت ناوە». ئەڵێ: «کوڕە گوو وە گۆڕ باوك خۆیشم! هەر فەقێ محەمەدە باوەحیزەکەی تۆی بەرکەوێ، من قیروسیا!)».

**٢٨٩.** مەلا حەبیبی مەلا وەیسە هەبوو لە وڵاتی کەرکووکەوە هاتبوو بۆ سولەیمانی بۆ خوێندن. ساڵیش (١٩٣٤) بوو. ئەو لە خانەقای مەحوی و من لە مزگەوتی حاجی مەلاڕەسووڵ لە خزمەتی مەلا مستەفادا ئەمخوێند. دۆستایەتیمان هەبوو، عەسرێك هات بۆ لام، ئەم مەلا حەبیبە «شەل» بوو. لە قەدیوانی بەرهەیوانەکە شیعرێکی نووسی بۆ یادگار و ناوی خۆی لە ژێرا نووسی: «حبیب لنگ» لەسەر شێوە ئیملای کۆن.

وتم: مەلا حەبیب «لنگ» یانێ چی؟ وتی: یانێ «شەل». وتم: جا خۆ خەڵك بە جۆرێکی‌تری ئەخوێننەوە. وتی: بە چی ئەخوێننەوە؟ وتم: بە «لنگ ـ لونگ» ئەیخوێننەوە. وتی: «لونگ» یانێ چی؟ وتم: یەعنی

«پەشتەماڵ». ئەویش هێنای لە ژێر «لنگ»ـەکەدا نووسی: «شل [شەل]»؛ بەڵام لەبەر ئەوە خەتەکەی جوان نەبوو «شل»ـەکەی وەکوو «شڕ» نووسی. وتم: جا ئێستە خراپتر؛ ئێستە خەڵك «شل»ـەکە بە «شڕ» ئەخوێننەوە؛ واتە پەشتەماڵەکە ئەوەندە دڕاوە بە بەر خەڵکەوە شڕ و وڕ بووە بەسەر یەکا.

ئەمجا تۆزێ ڕاما، قەڵەمەکەی دەرهێنایەوە هەرچی هەبوو نەبوو هەمووی کوژاندەوە وتی: «خەڵکی سولەیمانی پێوە لە نەگاوراو پیاو ئەگێن، بەڵام لە چارەی خۆتان و وڵاتتاندا». لە پاش بەینێك ئیتر چووەوە بۆ کەرکووك.

٢٩٠. ژنێك هەبوو لە «سنە» فەرخی خانمی ناو بوو. ئیشی فەرخی خانم ئەوە بوو ئەچوو پیاوێکی نەشارەزای ئەدۆزییەوە مێردی پێ ئەکرد، لە پاش دوو سێ شەو تەڵاقی خۆی لێ ئەسەند، بە مارەیی و حەق و حقووقەوە. بەو مارەیی و شتە ئەژیا تا تەواو ئەبوو؛ ئەمجا ئەچوو یەکێکی تری ئەبینییەوە. بەم جۆرە تەغارەی تەواو کردبوو.

جارێك «سەی حەمەسەن»ـێکی سەقزی ئەچێتە ئەوێ، فەرخی خانم خۆی تێ هەڵئەسوێ و خۆی لێ مارە ئەکا. لە پاش دوو شەو بیانووی پێ ئەگرێ و ئەڵێ: ئەبێ تەڵاقم بدەی. دنیاش شەو و مانگەشەو بوو، لەسەر عادەتی کوردەواری کوڕوکاڵ لەسەر سەرەنوێلك لەبەر مانگەشەوەکەدا دانیشتبوون. ئەوانیش ئەیانزانی لە کاروباری فەرخی خانم، بووبوون وەکوو دەلاڵ بۆی، بۆ تەڵاق دانەکە. فەرخی خانمیش بەو شەوە لە بەرچاو ئەوانەوە پێی لە سەی حەمەسەن کردبوو بە [کەوشا] ئەوشۆ کە تەڵاقی بدا. کوڕوکاڵیش ئەیانوت: «ئاسەی حەمەسەن، فەرخی خانم

ژنێکی خاس نییە، هەر ڕۆژێ بە بەر یەکێکەوەس تەڵاقی دە با بڕوا».
ئەمەش فەرخی‌خانم خۆی فێری کردبوون. سەی حەمەسەنیش تەڵاقی نەئەدا.

لە ئەنجاما هاتە سەر ئەوە لە پاش ئەوە کە ئەوان زۆر ڕوویان لێ‌نا وتی: «باوە ئیمشەو وازم لێ بێرن سۆزی وە بان چاو، تەڵاقی ئەدەم».

**٢٩١.** ئەحەی کرنوو جارێك ئەچێتە ئەو شارەزوورە پیرێژنێك دێتە لای ئەڵێ: تۆ حەکیمی؟ ئەڵێ: بەڵێ. ئەڵێ: سەرم ژان ئەکا. ئەڵێ: هی پیرییە. ئەڵێ: پشتم، پشتم ژان ئەکا دەرمانێکم پێ بێژە. ئەڵێ: هی پیرییە. ئەڵێ: قاچم ژان ئەکا. ئەڵێ: هی پیرییە. هەر شتێك ئەڵێ، ئەم هەر ئەڵێ: هی پیرییە. پیرێژنە تووڕە ئەبێ و دەست ئەکا بە لاسایی کردنەوەی و ئەڵێ: یەیەیەیە! ئەحەی کرنووش ئەڵێ: ئەوەش هەر هی پیرییە.

**٢٩٢.** لۆتی ڕەحیم هەبوو لە «سنە» عەنتەرێکی هەبوو. ڕۆژێك، جاف کە ئەچوون بۆ کوێستان خورمایان لەگەڵ خۆیان ئەبرد. لە سنە لە عەنتەرەکە کۆ ئەبنەوە و چەند دەنکێ خورما ئەدەن بە عەنتەرەکە. عەنتەر دەستی برد دەنکێ لە خورماکانی دوو سێ جار کرد بە قنگی خۆیا و دەری هێنایەوە، ئەمجا ئەوانی‌تری خوارد.

یەکێك لە لۆتی ڕەحیمی پرسی: ئەوە ئەم عەنتەرە بۆچ وا ئەکا؟ وتی: ئەوە ئەم بەسەزمانە جارێك هەڵووژەمان دایە و خواردی، ناوکی هەڵووژەکە لە قنگیا گیری خوارد و دەرنەهات، زۆری نقان کەڵکی نەبوو وەختەبوو بمرێ، لە ئاخرا بە هەزار فرتوفێڵ بە «جەڕبادەر» دەرمان هێنا. عەنتەرەکە زۆر تووشی عەزیەت و ئازار بوو. ئێستە لەو وەختەوە هەر

شتێکی بدرێتێ لە پێشا ئەیکا بە قنگی خۆیا بزانێ دەردێتەوە یان نە؛ ئەو وەختە ئەیخوا.

٢٩٣. هەر ئەم لۆتی ڕەحیمە مەیموونە بچکۆڵەیەکیشی هەبوو ئەیدایە بن دەستی و ئەچووەماڵە ئەعیانەکانی سنە بۆ ئەوە شتی بدەنێ. لەبەر ئەوە کە زۆر زۆر ئەچوو، ئەوانیش لێی وەڕس ئەبوون. ئەمجا ئەچووە ئەندەروون، خانمگەلیش هەر گوێیان نەئەدایە. ئەمیش سەری مەیموونەکەی لە بن دەستیەوە دەرئەخست، مەیموون ددانێکی ڕیچ ئەکردەوە لە خانم، خانم لە تاو گیانی خۆی و لە ترسا بانگی ئەکرد: «ئەرێ کارەکەرگەل کێ لێنەس شتێك بدا بەو سەگباوکە با بڕوا و گۆڕی گوم کا».

٢٩٤. ئەم قسەیە تۆ بیکە بە نموونە بۆ گەلێ داستان. ئەم چەند قسەیە «حسين عبدالله» لە قەڵادزەوە ناردوویە بۆ ڕشتە و ئەڵێ:

جارێك لە گوندی «شێنێ» کچێك گوایە لەگەڵ پۆلیسێك دەستی تێکەڵاو کردووە و زکی پڕ بووە، لەبەر ئەمە کەسوکارەکەی ئەیانەوێ بیکوژن. لێرەدا دایکی کچە ئەڵێ: «با لێی گەڕێین تا مناڵەکەی دەبێ، ئەگەر قۆپچە و ماشەڵڵای پێوە بوو، وەکوو مام پۆلیس، ئەوە لەوییە ئەنا لە ئی خۆنە و لێی کۆڵ دەدەین».

٢٩٥. جارێك قائیمقامی قەڵادزە بۆ پەیجۆری نوختەی پۆلیس ئەچێ بۆ گوندی «شێنێ»، خەڵکی گوندی لەگەڵ کوێخادا دێن بە پیریەوە. کوێخا ڕوو ئەکاتە قائیمقام و پێی ئەڵێ: «دە بەر حمرێت دەمرم ئینشەڵڵا ساڵێکی دی تەپیە پاش چاوش!».

٢٩٦. کابرایەکی ئەو بەرکێوە کوڕێکی ئەبێ ئەیەوێ ژنی بۆ بێنێ، دراوسێکیان ئەبێ، ئەچێ بۆ داخوازی کچەکە. ئەم پیاوەش هیچ شتێک نابا لە «گا»یەك زیاتر. باوکی کچە داوای گایەکەی لێ ئەکا، ئەگینا کچەکەی نادا بە کوڕەکەی. کابراش ئەڵێ: «برام من لە ماڵی دنیا هەر ئەو گایە شك ئەبەم، ئەگەر بیدەم بە تۆ چی بکەم؟»

کوڕە لەسەر کولانجەی سەر بانەکەوە گوێی گرتبوو، بە باوکەکەی ئەڵێ: بابە گا بازووی بدەرێ، بەخوا بابی گاکە ئەیترێنم. کچەش کە لەوێ دانیشتبوو سەری بەرز کردەوە و ڕووی کردە کوڕەکە و وتی: «ترحێو! بڕۆ گوو بکەم بە ڕیشی باوکتا، ئەی بۆ ئەو ساڵە کوڕی عەمەدی وەتمانێ لە کوێستان سوارم بوو، هیچ نەشی تراندم؟!».

٢٩٧. هەر لەو بەرکێوە کابرایەك ژنێك دێنێ، بەڵام هیچی لێ ناکا تا چەند ڕۆژێك. ڕۆژێك بەیانی زوو ژنەکە ئەچێ بۆ کانی، سەیر ئەکا چەند ژنێك مەلە ئەکەن، ئەویش لێیان ئەپرسێ: ئەوە بۆچ ئێوە هەمووتان هەر مەلە ئەکەن؟ ئەوانیش تێی ئەگەیەنن کە لەبەر چی و بۆچییە ئەم مەلە کردنەیان.

کە ئەچێتە ماڵەوە بۆ مێردەکەی ئەگێڕێتەوە و پێی ئەڵێ: ئەبێ تۆش وا بکەی. پیاوە ئەڵێ: «من پێوەم نییە». ئەڵێ: بکڕە. ئەڵێ: پارەم نییە. ژنە ئەڵێ: کابرا، تارانییەکان تەوقەسەرمت ئەدەمێ بچۆ بکڕە، یاخۆ بخوازە. کابرا تارانییەکان وەرئەگرێ و بۆ سبەی شەوێ کێر و گونی نیشانی ژنەکەی ئەدا. ئەڵێ: ها ئەمەم کڕیوە. ژنە دەستێکی لێ ئەدا و ئەڵێ: باشە، ئەی ئەو دوو گوڵەنگە بۆچییە وا هێناوتە؟ ئەڵێ: وەڵڵا ئافرەت ئەوانە بۆ جوانی هێناومن. ژنە ئەڵێ: «جا پیاوەکە! پیاوی هەژار و بێ پارە و پوول جوانی

بۆ چییە؟ بریا ئەوانە، یان بخرانایە سەر درێژی وەیا پانی ئەوەی کە خۆت پێی ئەڵێیت کێر!».

**٢٩٨.** ئایەتی گۆپاڵ:

بــۆ کاروان ئەچوو مەلای مەخموورە
دەشــیگوت: ڕێگام گوندێکی دوورە
ژنەکــەی وتــی: ئایەتەلکورســی
بۆ تۆ زۆر باشــە لە ســەگ دەترســی
ئەگــەر بــۆت هاتــن بۆیــان بخوێنە
گوتــی: عافرەتــێ بەســم بدوێنــە
کســۆکی لادێ نەخوێنــدەوارە
لــە قورعــان ناگا چــاری هــەر دارە
سوورەی گۆپاڵیان لەســەر دەخوێنم
گەر تێنەگەیشــم نەگەن دەمیان دەشکێنم

**٢٩٩.** کابرایەك لەو وڵاتی «بانە»یە کەوتە سەروسەودای ژن هێنان، بەڵام ئەیویست ئەم ژنە کە ئەیهێنێ کچ بێ؛ کچیشی دەست نەئەکەوت. لە ئەنجاما ئافرەتێکیان بۆ هەڵدا وتیان: ئافرەتێکی زۆر بە سەروبەر و ئیش لێهاتووە. ئەوەندە هەیە چەند مێردێکی کردووە. وتی: چەند مێردی کردووە؟ وتیان: بەخوا تەغاری تەواو کردووە. وتی: ئایا لەم مێردانە هیچ «مەلا» و «جۆلا»یان تێدا هەبووە؟ وتیان: نەء. وتی: دەسا هەر کچە و من بە ئاواتی خۆم گەیشتم.

**٣٠٠.** ژنێکی تورکمان لەگەڵ مێردەکەیا ئەچن بۆ گوێی ئەو ڕووبارە مەلە بکەن، ژنەکە ئەچێتە ناو ئاوەکە و کتوپڕ قرژاڵێك لەناو

ئاوەکەدا قەپ ئەکا بە دوابڕاوەکەیا. ژنە هاواری لێ بەرز ئەبێتەوە.

ئەو دەنگەش بڵاوە ئەگەر قرژاڵ قەپی کرد بە شتێکا فووی لێ بکرێ بەرەڵای ئەکا. مێردەکەی ئەچێ فوو ئەکا بە قرژاڵەکەدا، قرژاڵ بە سەرەکەی‌تری لێوی کابراش ئەگرێ و لەگەڵ دوابڕاوەی ئافرەتەکەدا جووتی ئەکا. کابراش لەگەڵ ئەوەدا هەر لە فوو کردن ناکەوێ. لەو کاتەدا ئافرەتەکە لە تاوانا بایەکی لێ ئەبێتەوە و ئەیدا بە لووتی کابرادا. کابرا ئەڵێ: «هەی هەی تۆ فوو نەکەران، فووتەن گەنیایان، با هەروا بمانااین کەر لە بەغدا مەزەڕان».

٣٠١. کابرایەکی موکریانی بڕە عەلەشیشێکی دابووە بەر و گەیشتە ئەو دەشتی شارەزوورە. کابرایەکی شارەزووری لە کابرایەکی دراوسێ ئەپرسێ ـ کە عەلەی ناو ئەبێ ـ ئەڵێ: هۆ! عەلە عەلە! ئەو سوورە مل درێژە پیسانە چین؟ ئەویش ئەڵێ: ئێژن عەلەشیشن. ئەڵێ: عەلەشیش چییە؟ ئابرا تۆ دەنگ، قنگیان هەس؟ ئەڵێ: «برا هەس هەسی و هەس نیەسی و هەس وە دوانیان قنگێکیان هەس!».

٣٠٢. کابرایەك لەو دەشتی دزەییە لە کابرایەکی دوورە دەست ئەپرسێ ئەڵێ: برا بارانتان؟ ئەویش ئەڵێ: «پەڵەی ئێمەی دایە و خەڵکی بە گونان!».

٣٠٣. لەو سەنگاوە پیاوێکی شێخ قادری گوڵلەنەبڕ ژن دێنێت. لە سبەینێدا ئەچێ دەست شێخ ماچ ئەکا. شێخ سەیر ئەکا کابرا ڕەنگی تۆزێ هەڵبزڕکاوە ئەڵێ: سمە! لام وایە ژنەکەت ناشیرینە؟ سمەش ئەڵێ: «یا شێخ شەروەت وێ لە ڕووتا ئێژی گاگتە!».

٣٠٤. کابرایەك لەو بەر کێوە فێر بووبوو ڕاوە چۆلەکەی ئەکرد. هەر چۆلەکەیەکی کە ئەگرت سەری هەڵئەکەند و ئەیخستە سەبەتەکەیەوە تا پڕ ئەبوو، ئەیهێنایەوە و ئەیانخوارد. ساڵ دوانزە مانگەی خوا ئەمە ئیشی بوو.

ڕۆژێك هات بە سەریا وتی: با بچم پرسی مەلا بکەم بزانم ئەمە کە من سەری ئەم چۆلەکانە هەڵئەکەنم حەلاڵە یا حەرامە؟ مەلایەك لە گوندەکەیانا هەبوو؛ چوو سەبەتەیە چۆلەکەی بۆ بردەماڵەوە و خۆیشی چوو بۆ مزگەوت و پێی وت: مامۆستا من ئیشم ئەوەیە ڕاوە چۆلەکە ئەکەم و زۆرتر بەوە ئەژیم، بەڵام سەری نابڕم، هەر ملی هەڵئەکەنم؛ ئایا ئەمە حەلاڵە یا حەرامە؟

مامۆستا وتی: باوکم، شتی وا حەرامە، چۆن ئەبێ ملی هەڵکێشی؟ ئەبێ سەری بڕی. پاشان کابرا وتی: دەسا بەخوا مامۆستا سەبەتەیەکیشم بۆ ئێوە بردە ماڵەوە بۆتان. مامۆستا تۆزێ ڕاما و پاشان وتی: «ئا تۆ دەنگ! لەو وەختەدا کە سەریان هەڵئەکەنی ئەڵێن: «جری وری»، یا «وری جری؟»»! مەبەستی ئەوە بوو کابرا هەرکامیان بڵێ حەلاڵە. وتی: بەخوا مامۆستا ئەڵێن: «جری وری» وتی: کەواتە حەلاڵە!.

٣٠٥. کابرایەکی خۆشناو کەرێکی هەبوو لێی ون بووبوو، گەلێ بە شوێنیا گەڕا، نەیدۆزییەوە. ئەمجا لە پاڵ بەردێکا دەستی کرد بە هەڵپەڕین و بە دەمیشیەوە گۆرانی وتن. یەك دوو کەس لەوانە کە ئەو لێی پرسیبوون بۆ کەرەکەی، هاتن بە سەریا و لێیان پرسی: ئەمە چییە؟ یەکێ کەری لێ ون ببێ وا ئەکا؟ وتی: «خارینە! ئەنگۆ نایزانن، من ما وا دەکەم لۆ ئەوەی کەرەکێکم لە بنە تاشێکا بە چاوە خۆ بینێ کە من چ

بە تەنگیەوە نیمە، ئەمجا لۆ خۆی بێتەوە لۆ مارێ!».

٣٠٦. وا ئەگێڕنەوە کە: لە زەمانی سولەیمانی پێغەمبەردا شەڕێك ڕووی دا؛ پیاوان چوون بۆ ئەو شەڕە و سەر نەکەوتن، پاشان سولەیمانی پێغەمبەر ژنانی نارد و ئەوان شەڕەکەیان بردەوە. سولەیمان پێی فەرموون: چیتان ئەوێ لە تۆڵەی ئەم ئازایەتییەدا تا بتاندەمێ؟ ئەوانیش وتیان: هیچمان ناوێ، ئەوە نەبێ کە لەباتی ئەوە هەر پیاوێك دە ژنی هەیە، هەر ژنێ: دە پیاوی هەبێ!.

سولەیمانی پێغەمبەر فەرمووی: ئەمە نابێت و خوا وای نەکردووە. ژنان هاتنەوە و کەوتنە سەر ئەوە کە لەم ڕووەوە قاقەزێك بنووسن بۆ خوا. قاقەزیان نووسی و دایان بە قەلەڕەش بۆیان بەرێ، قەلەڕەش قاقەزی گرت بە دەنووکەوە و بردی.

لەو وەختەوە ئیتر هەرچی قەلەڕەش بە ئاسمانەوە دەرئەکەوێ و ئەقرێنێ، ژنان ئەڵێن: «خێر خێر»؛ واتە ئەبێ خەبەرێکی خێر و خۆشی قاقەزەکەت هێنابێتەوە!

٣٠٧. کابرایەکی یۆسۆجانی هەبوو پیاوێکی زۆر لەخوا ترس و هەموو وەختێ لەلای مەلا و لە کۆڕی فەقێیانا ڕایئەبوارد، گەلێ شت لێیانەوە فێر بووبوو. جارێك لە «وارماوا» مەلاکە سەیر ئەکا ئەم کابرایە تەزبێحێکی بە دەستەوەیە ئەڵێ: «نەسبحان اللّٰه، نەسبحان اللّٰه» مەلا لێی ئەپرسێ ئەڵێ: ئەرێ ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟. خۆ ئەمە کفرە تۆ ئەیڵێیت! ئەویش ئەڵێ: «بەخوا مامۆستا من نەزرم کردگە چوار تەزبێح «سبحان اللّٰه» بکەم، کەچی لە دواییدا سەیرم کرد پێنج تەزبێحم کردگە، ئێستە تەزبێحەکەی تری ئەسێنمەوە با هەر چوارەکەی بۆ ئەو وێ!».

**٣٠٨.** عەشرەتی «ئێناخی» لەوبەری «سیروان»ـەوە خستبوویان. «نەوڕۆڵی»ش لەمبەری سیروانەوە. مردووێك لە ئێناخییەكان مردبوو. نەوڕۆڵیگەل ئەچن بۆ پرسە، كە ئەگەنە سەر سیروان، سەیر ئەكەن سیروان هاتووە و ناتوانن لێی بدەن. یەكێ لە نەوڕۆڵییەكان لەمبەر ئاوەكەوە بانگ ئەكا: «هۆ! مارف، مارف، هۆ!» مارف خاوەنی پرسەی ئێناخییەكان بوو، ئەویش هەر لەناو دەوارەكەوە لەناو پرسەكەدا ئەڵێ: «هۆ بەڵێ. هۆ بەڵێ». ئەڵێ: ئا بێ. ئەویش دێتە سەر سیروان ئەڵێ: ها، برا ئێژی چی؟ ئەمیش ئەڵێ: «برا ئێمە هاتگین بۆ پرسە، ئەوا چاوت لێیە سیروان هاتگە نایەڵێ بدەین [لە ئاو]، ئەوا هەر لێرەوە فاحیتە»!.

هەموو دەست بەرز ئەكەنەوە فاتیحەكە ئەخوێنن، ئەمجا هەر یەكە بە شوێن خۆیانا ئەگەڕێنەوە.

**٣٠٩.** كابرایەك هەبوو لە گوندی «تەڕەمار» پیرەكچێكی هەبوو لەبەر ئەوە كە نەیدابوو بە شوو، هەر مابووەوە. ڕۆژێك كچە دەست ئەدا بە سەر وانێكەكەیا و ئەڵێ: «بەختە! هەڵنەستی كوڕوكاڵت تێ بەر ئەدەم». لەو كاتەدا كە ئەم قسەیە ئەكا، باوكی لە پشتیەوە ئەبێ و ئەم پێی نازانێ، گوێی لە قسەكەی ئەبێ، ئەڵێ: ئەگەر چارێكی نەكەم ئەم چەتیوە ئابڕووم ئەبات. كچە دایك و براشی هەبوو.

كابرای باوكە چوو بۆ مزگەوت. كە خەڵك كۆ بوونەوە وتی: بەخوا كچی قەیرە لە ماڵابوون گوناحە، ئەمەوێ كچەكەم بدەم بە شوو. ئەم قسەیەی بۆ پیاوێكی دراوسێیان ئەكرد كە لە مزگەوتا لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو. گوایە قسەكە تەنیا هەر بۆ ئەو ئەكا بەڵام وای ئەكرد كە خەڵكی‌تریش گوێیان لێ بێ. كوڕە پیرێكیش گوێی لە قسەكان بوو، ئەویش دەمێك

بوو بەتەما بوو ژن بێنێ، بەڵام ژنی دەست نەئەکەوت، سەرێکی قوت کردەوە و چووە بن دەستیەوە. لالە حەمەسەنیش قسەکەی هەر نەبڕی. پاشان کوڕەکە وتی: لالە حەمەسەن، ئەگەر تۆ بتەوێ کچەکەت بدەی بە شوو لە منت چاکتر دەست ناکەوێ، بیدە بە من. لالە حەمەسەنیش وتی: باشە کوڕم، وەرە بۆماڵەوە. پارە و شتە چی پێویستە بیهێنە، وا دیارە خوا نەسیبی خستوونەتە یەك.

شەوێ کوڕە لەگەڵ دوو سێ پیاوماقووڵی ئاواییدا چوون بۆ ماڵی لالە حەمەسەن. گفت و قسەی خۆیان بڕاندەوە و لەسەر سەد قڕان ڕێك‌کەوتن. کوڕە سەد قڕانەکەی دەرهێنا دای بە دەست برای کچەکەوە و ئەویش کەوتە ژماردنی.

کچە لەولاوە نیسکێنەی لێ ئەنا لە خۆشییا پێی بە عەرز نەئەکەوت، لەو کاتەدا پرشێ لە نیسکێنەکە هەڵپڕژایەوە و کەوت بەسەر دەستیا، دەستی سووتا. وتی: «دەستمت سووتان، ڕیامە ناوتا!». بابەکەی گوێی لێبوو وتی: «چێشتەکەت پیس کرد، بەرم بە قنگتا!». دایکەکەی ئاگری تێ بەر بوو وتی: «قنگی کچەکەمت دڕی، ڕیام بە ڕیشتا!». براکەی وتی: «حسابی پارەکەتان لێ تێك دام، گووم کرد بە دەمی گشتانا».

کوڕەی زاوا هەستایە سەر پێی، دەستی کرد بە هەڵپەڕکێ و سووڕدان و وتی: «هەر لە ئێستە شایی کەرانە و دەست بە ملانە و گوو لە دەمانە».

٣١٠. لەو وڵاتی ئاڵانە لە گوندی «گروێس» بێوەژنێکی تەرپیری مێخەك لە مل هەبوو، «باجی‌هامینە»یان پێ ئەوت. پارچە شکارتەیەکی ماشی هەبوو وەختی دروێنەی هاتبوو بەدەستیەوە دامابوو؛ سەپانێکی وای دەست نەئەکەوت بۆی بدروێتەوە.

ڕۆژێك خۆی دا لەدەق و چاوەکانی پڕ لە کل کرد و لاگیرە و کەمەرەی مێخەکەکەی خستە ملی. کوڕوکاڵ لە بەر مزگەوتا دانیشتبوون، چوو بە لایانەوە، بە تیلایی چاوێك سەیری کردن، بە زەردەخەنەیەکەوە ڕووی تێ‌کردن و وتی: لە منتان نەکەوێ! چۆن ئێوە دڵتان بڕوایی ئەدا ئەو ماشەی من هەروا بمێنێتەوە؟ تیلی چاوەکەشی ئەکێشا بە سەریانا.

کوڕوکاڵ هەریەکە لە عاستی خۆیان دەستیان دا بە سنگیانا کە سبەینێ بە هەرەوەز بۆی بدروونەوە. ئەو تیلایی چاوە کاری کردە هەموویان. هەرکە لە ئاقاری خۆی، خۆی بە نیشانەی ئەو تیلایی چاوە ئەزانی.

باجی هامینەش ئەزانێ وا دەستی خۆی وەشاندووە، بەڵام ماشی سەگباب بە ڕۆژێك نادوورێتەوە. کەوتە بەیانی، یەکە یەکە چوو بەلای کوڕگەلەوە، هەریەکە هێمایەکی بۆ ئەکرد و توورەکەیە سێویشی لە باخەڵیا شاردبووەوە، سێوێکی ئەدایە و ئەیوت: ئەمە بخەرە باخەڵت بۆ ئەوە یادگاری من بێ لەلای تۆ!.

کوڕگەل چوون نیشتن بە پیرە ماشەوە؛ جارجار باجی هامینە لە دوورەوە قریوەیەکی ئەکرد و ئەیوت: «هەی بەقوربانی کوڕی سێو لە باخەڵ بم!».

هەرکەس لەوانەش لای وابوو تەنها ئەو سێوی لە باخەڵایە و ئەم «بەقوربان»ـە بۆ ئەوە. بینیان پێوە نا، نەکەوتە نیوەڕۆ تەقەیان لەوسەری پەڵەماشەوە هەڵساوە و هەموویان دووریییەوە. بەم جۆرە باجی هامینە دەستی خۆی وەشاند و کوڕگەلیش دەست لە گونان بەرەو ژێرتر بۆی دەرچوون».

٢٦٨٠ ك / ١٩٨٠ م/ ١٤٠٠ هـ





عاشقی وشەی خاوێنی کورد، کەلەپیاوی بەدەستوبرد، هۆگری داب‌ونەریتی کوردەواری، کۆکەرەوەی کەلەپوور لە دێهات و شاری، زیندووکەرەوەی شادی، شێخ عەلائەددینی سەججادی.

ناوی «عەلائەددین نەجمەددین عیسامەددین»ە و لە بنەماڵەی ناوداری «سەججادی»یە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. لە ساڵی ۱۹۰۷ی زایینی لە سنەدا هاتۆتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا پەروەردە کراوە. لە ساڵی ۱۹۳۸ی زایینی ئیجازەی مەلایەتی لای مامۆستا «شێخ بابەعەلی تەکیەیی» وەرگرتووە و چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی «نەعیمە خاتوون» بووە بە پێش‌نوێژ. لە بەغداش لای مامۆستایان شێخ «ئەمجەدی زەهاوی» و شێخ «محەممەدی قزڵجی» بە هەندێ لە زانستە ئیسلامییەکاندا چۆتەوە. لە ساڵی ۱۹۳۹ی زایینیدا چۆتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی و لە ۱۹٤۱دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری «گەلاوێژ» و وردە وردە بووە بە هەمەکارەی و تا داخستنی لە ۱۹٤۹دا لەگەڵی بووە.

لە ساڵی ۱۹٤۸دا گۆڤاری «نزار»ی بە عەرەبی و کوردی دەرکردووە، کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری و سیاسی بووە. تا ساڵی ۱۹۷٤ مامۆستای وێژە و مێژووی وێژەی کوردی بووە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا. لە ساڵی ۱۹۷٤دا کرا بە ئەمینداری گشتی ئەوقاف و سێ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

ئێوارەی ڕۆژی پێنج‌شەممەی ۱۹۸٤/۱۲/۱٤ی زایینی، کۆچی‌دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە نزیکی شێخ عەبدوڕڕەحمانی ئەبولوەفای نەقشبەندی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاک سپێرراوە.

عەلائەددینی سەججادی زیاتر لە چل ساڵ خەریکی زیندووکردنەوەی کەلەپوور و نووسینی مێژووی وێژەی کورد بوو. تێکۆشانی بێ‌وچانی ئەم پایەبەرزە نەیهێشت کە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوەکەمان بفەوتێ.

**ناوی بەرز و ڕۆحی شاد بێت**




انتشارات کردستان

Kurdistan Publication

سنندج ـ پاساژ عرتی ـ تلفن: ۳۳۱۶۵۳۸۲





جلد ششم

9 789649 804170





شابک دوره

9 789649 804118